# كتاب الفتن



نووسینی:

أبي بكر محمد بن الحسين بن عبد الله الآجري

وەرگێرانی : أبوعبدالله

پێداچوونەوەی : هلال عبدالله عمر

# ١ - بابى فەزڵى دانیشتن لە كاتى فیتنە لەوەى بچیتە ناوى، وە ترسى عاقڵەكان لەوەى شتێك بكەوێتە ناو دڵیان لەو هەوا و ئارەزووانەى كە الله تعالى ڕقى لێیەتى، وە مانەوە لە ماڵەوە و عیبادەت كردن بۆ الله تعالى

١ - عن أبي هريره رضي الله عنه، قال : قال رسول الله ﷺ : (تكون فتنة القاعدُ فيها خير من الماشي، والماشي فيها خير من الساعي، من يستشرف لها تستشرف له، ومن وجد منها ملجأً أو معاذاً فليعُذ به) .

واتە : (فیتنە [تاقیكردنەوە و ناخۆشی] دەبێت لە داهاتوویەكى نزیكدا كەسى دانیشتوو باشترە لەوەى دەڕوات، وە كەسى ڕۆیشتوو باشترە لەوەى ڕادەكات، وە هەركەسێ ڕووبەڕووى هەریەك لەو فیتنانە ببێتەوە ئەوا لەناوى دەبەن، جا هەركەسێك شوێنێك و پەناگەیەكى دۆزییەوە بۆخۆ پاراستن لەو فیتنانە، ئەوە پێویستە پەناى پێ بگرێ) .

---

: بە هەمان شێوە ئیمامى الآجري رحمه الله باب ێكى داناوە لە كتابى (الشريعه - ١/ ٣٩٢) .

وە هێناویەتی ئیمامی ابن بطە رحمه الله لە (الإبانة الكبرى) باب یێکی لەوشێوە، جا دەڵێت : (باب/١٣ : ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەر ﷺ ئوممەتەکەی لەو فیتنانەی کە دێن، وە فەرمانکردن بۆیان بە مانەوە لە ماڵەکانیان لە کاتی فیتنە، وە فەزڵی دانیشتن، وە دەست گرتنی عاقڵەکان بە ماڵەکانیان، وە ترسانیان لە دڵەکانیان لەوەی شوێن هەواو ئارەزوو بکەوێت، وە پاراستنی زمان و دینیان) .

- ئیمامی حرب الكرماني رحمه الله لە کتابی (السُّنه : ٣٢) دەڵێت : وە خۆگرتنەوە لەکاتی بەرپابوونی فیتنەدا سوننەتێکی تێپەڕیوە [واتە لەلایەن هاوەڵان و تابعین و سەلەفەوە هاتووە بەوانەدا تێپەڕیوە تاوەکو کاتی ئێستا]، واجبە ئەنجامی بدەیت .

وە ئەگەر تووشی ئەو تاقیکردنەوەیە بوویت : ئەوا نەفست، وە ماڵت بەخت بکە و پێشی بخە، جگە لە دینەکەت . هاوکارمەبە بۆگەورەکردن ونانەوەی فیتنە نە بەدەست نە بەزوبان، بەڵکو دەستت و زمانت و ئارەزووەکانت بگرەوە، الله خۆی بەندەکانی تاقیدەکاتەوە .

- ابن تيميه لە (الفتاوى الكبرى : ٣ / ٥٦١) دەڵێت : جا فیتنەکان وەکو جەنگەکان کە ڕوودەدات لە نێوان پاشاکانی مسوڵمانان و گرووپەکانیان، لەگەڵ ئەوەی هەریەك لەو دوو گرووپە پەیوەستە بە شەریعەتەکانی ئیسلام، وەکو ئەوەی ئەهلی جمل و صفين لەسەری بوون، وە بێگومان بەشەڕهاتن لەبەرگومانێك وڕووداوانێك کەوا ڕوویدا .

بەڵام جەنگان لەگەڵ خەواریج وزەکات نەدەرەکان و ئەوکۆمەڵەی کەوا ڕبایان بە حەڕام نەدەزانی، ئەوا ئەوانە جەنگیان لەگەڵ دەکرێ هەتاوەکو دێنە ناو شەریعەتی جێگیرەوە لە پێغەمبەر ﷺ) .

٢ - عن أبي هريره رضي الله عنه، قال : قال رسول الله ﷺ : (تكون فتن كرياح الصيف، القاعدُ فيها خير من القائم، والقائم فيها خير من الماشي، من استشرف لها استشرفته) .

واته : (فيتنه [تاقيكردنەوە و ناخۆشی] دەبێت لە داهاتوویەکی نزیکدا وەکو بای هاوین، کەسی دانیشتوو باشترە لەوەی وەستاوە، وە کەسی وەستاو باشترە لەوەی دەڕوات، وە هەرکەسێ ڕووبەڕووی هەریەك لەو فیتنانە ببێتەوە ئەوا لەناوی دەبەن) .

٣ - لە حمیدی کوڕی هلالەوە، لە پیاوێکی عبدالقیس کە لەگەڵ خەواریجەکان بوو، پاشان جیابووەوە لێیان .

دەڵێت : چوونە ناو گوندێکەوە جا عبداللهی کوڕی هاوەڵی بەڕێز خباب چووە دەرەوە بە ترساوی، عەباکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا، خەواریجەکان پێیان ووت : مەترسە، مەترسە، دوو جار .

عبدالله ووتی : سوێند بە الله منتان ترساند، ووتیان : تۆ عبداللهی کوڕی خبابی هاوەڵی رسول الله ﷺ ؟

ووتی : بەڵێ .

ووتیان : ئایا فەرموودەیەکت بیستووە لە باوکت کە گێڕابێتیەوە لە رسول الله ﷺ بۆمانی بگێڕیەوە؟

ووتی : بیستم باوکم دەیووت رسول الله ﷺ باسی فیتنەی کرد : (کەسی دانیشتوو باشترە لەوەی وەستاوە، وە کەسی وەستاو باشترە لەوەی دەڕوات، وە ئەوەی دەڕوات باشترە لەوەی ڕادەکات، فەرمووی : جا ئەگەر گەیشتی بە فیتنە ببە بە بەندەی کوژراو) .

أیوب دەڵێت : وە نازانم ئیللا فەرمووی : (بەندەی بکوژ مەبە) .

ووتیان : تۆ ئەوەت بیستووە لە باوکت دەیگێڕێتەوە لە رسول الله ﷺ ؟

ووتی : بەڵێ .

جا بردیان بۆسەر کەناری ڕووبار، لەگەردنیاندا، جا خوێنی ڕۆیشت بەبێ ئەوەی تێکەڵ بە ئاوی ڕووبارەکە ببێت، وە سکی هاوسەرەکەیان دڕی کە دووگیان بوو منداڵەکەشیان سەربڕی .

---

: **رواه احمد (٢١٠٦٤)، وابن ابي شيبه (٣٩٠٥١)**

**ابن تیمیە لە (منهاج السنة : ٦ / ٣٣٢) لەبارەی بە دروست زانینی شەڕکردن لەگەڵ خەواریج و خوێنیان لەلایەن ئیمامی عەلییەوە رضي الله عنه دەڵێت : خەواریج دەستیان بەوە کرد [واتە کوشتنی مسوڵمانان]، چونکە ئەوان بوون عبداللهی کوڕی خبابیان رضي الله عنه کوشت کاتێ گرتیان و داوایان لێکرد کەوا فەرموودەیەکیان**

بۆ بگێڕێتەوە لە باوکیەوە خبابی کوڕی الأرت رضي الله عنه، جا ئەویش فەرموودەیەکی بۆ گێڕانەوە لە بارەی وازهێنان لە فیتنە، وە ئەو مەبەستی ئەوەبوو ئەوان بگەڕێنەوە لە فیتنە، جا کوشتیان و خوێنەکەی مایەوە تێکەڵ نەبوو بە ئاوەکە .

بۆیە ئیمامی علي رضي الله عنه نوێنەرێکی نارد بۆ لای خەواریجەکان و پێی ووتن : بکوژی عبداللەی کوڕی خبابمان تەسلیم بکەن ، ئەوانیش ووتیان : ئێمە هەموومان کوشتمان، پاشان هێرشیان دەکردە سەر مەڕو ماڵاتی خەڵکی کاتێ دەیانبردن بۆ لەوەڕاندن .

جا کاتێ ئیمامی علي بینی کەوا خەواریجەکان خوێن و ماڵی مسوڵمانانیان بە حەڵاڵ زانیوە، ئەو فەرموودانەی باسکرد کە بیستبووی لە پێغەمبەر ﷺ لە وەسفی خەواریج، وە لە فەرمانکردنی بە جەنگان لەگەڵیان، وە بینی ئەو سیفەتانە جێبەجێ دەبێت لەسەریان، بۆیە جەنگا لەگەڵیان، وە الله تعالى ئیمامی علي رضي الله عنه سەرخست بەسەریاندا و ئەویش دڵخۆش بوو بەوە، وە سوجدەی شوکری برد بۆ الله تعالى کاتێ هەواڵی المخدجی بۆهات کەوا لەگەڵ خەواریجەکان بووە [المخدج بەکەسێ دەوترێ دەستەکانی بچووک بن]، چونکە بەڕاستی ئەوە ئەو نیشانەیە بوو کە رسول ﷺ هەواڵی لەبارەوە دابوو وهاوەڵان کۆدەنگ بوون لەسەرجەنگان لەگەڵیان، بۆیە جەنگی ئیمامی علي کوڕی ئەبو طالب رضي الله عنه لەگەڵ خەواریجەکان بە نەصی فەرموودەی رسول الله ﷺ وکۆدەنگی هاوەڵان بوو رضي الله عنهم .

٤ - أبا موسى رضي الله عنه يقول على المنبر : قال رسول الله ﷺ : (إن بين أيديكم فتناً كقطع الليل المُظلم، يصبح الرجل فيها مؤمنًا، ويُمسي كافرًا، ويُمسي

مؤمنًا، ويُصبح كافرًا، القاعد فيها خير من القائم، والقائم فيها خير من الماشي، والماشي فيها خير من الساعي) .

قالوا : فما تأمرنا؟

قال : (كونوا أحلاس بيوتكم) .

واته : (بێگومان كۆمەڵە فیتنەیەك دێتە پێشتانەوە وەكو پارچە شەوی تاریك پیاو بەیانی دەكاتەوە ئیماندارە و كە ئیوارە دادێت كافرە، وە ئێوارە دەكاتەوە ئیماندارە و كە بەیانی دەكاتەوە كافرە، كەسی دانیشتوو باشترە لەوەی وەستاوە، وە كەسی وەستاو باشترە لەوەی دەڕوات، وە ئەوەی دەڕوات باشترە لەوەی ڕادەكات) .

هاوەڵان ووتیان : فەرمانی چیمان پێدەكەیت ؟

فەرمووی: (لەماڵەكانتان بمێننەوە) .

---

: رواه احمد (١٩٦٦٢)، وأبو داود (٤٢٦٢)

٥ - رسول الله ﷺ قال : (ستكونُ فتنه بَكماءُ صَمَّاءُ عَمياءُ، المضطجعُ فيها خير من القاعد، والقاعدُ فيها خير من القائم، والقائِم فيها خير من الماشي، والماشي فيها خير من الساعي، ومن أبى فليمدُدُ عنقه) .

واته : (له داهاتوودا فیتنانێکی کەڕ و کوێر و لاڵ دەبێت، کەسی ڕاکشاو باشترە لەوەی دانیشتووە، وە کەسی دانیشتوو باشترە لەوەی وەستاوە، وە کەسی وەستاو باشترە لەوەی دەڕوات، وە ئەوەی دەڕوات باشترە لەوەی ڕا دەکات، وە ئەوەی نکۆڵیکرد با گەردنی درێژ بکات) .

٦ - قال رسول الله ﷺ : (تتقارب الفتن، ولا ينجو منها إلَّا من كَرِهها، ولم يأخذ المال، فإن أخذ المال فهو شريكهم في الدماء وغيرها) .

واته : (فیتنەکان لێك نزیك دەبنەوە و بەدوای یەك دادێن، وە ڕزگار نابێت لێی تەنها ئەوەی ڕقی لێیەتی، وە ماڵ و سامانیش نابات، چونکە بێگومان بردنی ماڵ و سامان هاوبەشیکردنیانە لە خوێن و جگە لەویش) .

محمدی کوڕی الحسین دەڵێت :

ئەو باب ەم باسکردووە لە کتابی (الفتن) فەرموودانێکی زۆرم گێڕاوەتەوە تێیدا، وە بەشێکیم لێرە باسکرد، بۆئەوەی ئیمانداری ژیر دینەکەی خۆی بپارێزێت، چونکە بەڕاستی فیتنە لە زۆر ڕووەوە دێت، کۆمەڵە فیتنەیەکی زۆر گەورە ڕۆشت لە پێش ئێمەوە، کۆمەڵێك ڕزگاریان بوو تێیدا، وە بە هیلاك چوون تێیدا کۆمەڵێك بە شوێنکەوتنیان بۆ هەوا و ئارەزووەکانی خۆیان، وە دونیایان هەڵبژارد .

جا ئەوەی الله تعالى خێر و چاکەی بۆ ویستبێ : دەرگای دوعا و پاڕانەوەی بۆ دەکاتەوە، وە پەنا دەگرێ بە گەورەی کەریمی، وە لە دینەکەی دەترسێ [لەوەی لەدەستی بدات]، وە زمانی دەپارێزێت، وە سەردەمەکەی خۆی دەناسێت، وە دەست دەگرێ بە بەڵگە ڕوون و ئاشکراکە [قورئان و سوننەت بە تێگەیشتنی سەلەفی ئوممەت والله اعلم]، السواد الأعظم [السواد : بریتین لە ئەهلی حەق، ئەهلی حەق ئەوانەن دەستیان پێوە گرتووە، وە مەبەست لە (السواد الاعظم) تەنها زۆرینە نییە بەڵکو ئەوانەی لەسەر حەقن هەرچەندە کەمیش بن]، وە پشتیان لێناکات لە دینەکی [واتە پێچەوانەی سەلەف ناکات لە دینەکەی والله اعلم]، وە پەروەردگاری خۆی دەپەرستێت، بۆیە وازدەهێنێ لە ڕۆچوون و چونە ناو فیتنە، چونکە لەکاتی ڕوودانی فیتنە خەڵکانێکی زۆر فەزح دەبن، ئایا ووتەی پێغەمبەرت ﷺ نەبیستووە، کاتێ ئاگاداری ئوممەتەکەی دەکاتەوە لە فیتنە؟

دەفەرمووێ : (یصبح الرجل مؤمناً، ویُمسي کافراً، ویُمسي مؤمناً، ویُصبح کافراً) .

واتە : (پیاو بەیانی دەکاتەوە ئیماندارە و کە ئیوارە دادێت کافرە، وە ئێوارە دەکاتەوە ئیماندارە و کە بەیانی دەکاتەوە کافرە) .

---

: إبن بطە لە (الإبانة الكبرى - ٨١٠) دەڵێت : جا فیتنە لەسەرچەند ڕووو جۆرێکی زۆرە، لەسەرەتای ئەو ئوممەتە چەند فیتنەیەکی گەورە ڕوویداوە، تیایدا ڕزگاریان بووە

کۆمەڵە خەڵكێكی زۆر كە الله تعالی پاراستنی لەو فیتنانە بەهۆی تەقوا و لە الله ترسانیان .

وە هەموو فیتنەیەكی گومڕاكەرو لەناوبەرو زیانبەخش بە دین و دنیا حەڵاڵ بووە بەسەر خەڵكی ئەم سەردەمەی ئێمە، وە كۆبووەتەوە لەسەریان لەگەڵ ئەو فیتنەیەی تیایدان كە خۆیان ئاگرەكەیان هەڵگیرساندووە، وە تەقلیدی فیتنەی پێش و پاشیان كرد لە سەردەمەكانی سەلەف، ئینجا دەبینی زۆرینەی ئەوانەی لەناو دەچن بە فیتنەی پێشین و پاشین ئەو كەسانەن كە شوێن هەوا و ئارەزووەكانی خۆیان دەكەون و دونیایان هەڵبژاردووە .

جا نیشانەی ئەو كەسەی كە الله تعالی چاكەی بۆ ویستووە، وە لەو كەسانەیە كە چاودێری و پاراستنی مەولای بەخشندە [و اتە الله تعالی] بۆ پێش كەوتووە : ئەوا دەرگای پاڕانەوەی بۆ دەكرێتەوە بەپەنا گرتن، وە زەلیل بوون بۆ الله تعالی بە سەلامەت و رزگاربوون، وە بێدەنگی پێدەدرێ تەنها لەوە نەبێ كە ڕازی بوونی بۆ الله تعالی تێدایە، وە چاكسازیشە بۆ دینەكەی، وە پارێزگار بێت بۆ زمانی و خەڵكی سەردەمەكەی خۆی بناسێت، ڕووی كردبێتە ئیش و كاری خۆی، وازهێنابێت لە قسە و مناقەشە لەشتێك كە پەیوەندی پێوە نییە، وە لە مەسئەلەو هەواڵانێك كە دەكرێ بەرەو لەناوچوونی ببەن، خۆشیناوێت تەنها لە پێناو الله تعالی نەبێ، وە ڕقی لە كەس نابێتەوە تەنها لە پێناوئەونەبێت، بەڕاستی ئەوفیتنە و ئارەزوو انە خەڵكێكی زۆری فەزح كردووە، وە پەردەكانی هەڵدانەوە لە حاڵەتانێكی قەبیح و ناشرین، جا بۆیە پارێزەرترین كەس بۆ نەفسی خۆی پارێزەرترینیانە بۆ زمانی، وە سەرقاڵترینیانە بە دینەكەی، وە وازهێنەرترینیانە لەوەی كەوا پەیوەندی بە ئەوەوە نییە .

٧ - عن أبي أمامه رضي الله عنه، عن النبي ﷺ قال : (ستكون فتن يُصبحُ الرجل فيها مومناً، و يُمسي كافراً، إلَّا من أحياه الله بالعلم) .

واته : (له داهاتوودا فیتنانێك دەبێت پیاو بەیانی دەكاتەوە ئیمانداره و كه ئیواره دادێت كافره، تەنها ئەو كەسه نەبێ كه الله تعالى زانستی پێبەخشیوه) .

٨ - عن أبي هريره رضي الله عنه، عن النبي ﷺ قال : (بادروا بالأعمال، ستكون فتن كقطع الليل المُظلم، يُصبحُ الرجل مومنًا، ويُمسي كافرًا، ويُمسي مومنًا، ويُصبحُ كافرًا، يبيعُ الرجل دينه بعرضِ من الدنيا) .

واته : (پەله بكەن له كاری چاكه، كۆمەڵه فیتنەیەك دێته پێشتانەوه وەكو پارچه شەوی تاریك، پیاو بەیانی دەكاتەوە ئیمانداره و كه ئیواره دادێت كافره، وه ئێواره دەكاتەوە ئیمانداره و كه بەیانی دەكاتەوە كافره، پیاو دینەكەی دەفرۆشێت به نرخێكی كەمی دونیا) .

٩ - له سەعیدی كوڕی جبیر ـەوه رحمه الله، دەڵێت : راهب پێی ووتم : ئەی سەعید، لەكاتی فیتنەدا بۆت ڕوون دەبێتەوە كەوا كێ الله تعالى دەپەرستێت، وه كێش طاغوت دەپەرستێت .

١٠ - قال رسول الله ﷺ : (العبادة في الهرج كالهجره إليَّ) .

واته : (عیبادەت و پەرستش لە کاتی شەڕ و کوشتاردا وەکو کۆچکردنە بۆ لای من) .

١١ - ابن عباس رضي الله عنهما، دەڵێت : بۆی گێڕامەوە عبداللهی کوڕی عمری کوڕی عاص رضي الله عنهما، دەفەرمووێت : کاتێك ئێمە لە دەوری رسول الله بووین ﷺ، باسی فیتنەیان لە لای کرد یان ئەو باسی کرد، جا فەرمووی : (ئەگەر خەڵکیت بینی کەوا بەڵێنەکانیان دەشکاند و نەیان دەبردە سەر، وە ئەمانەت پارێزیان تێدا کەمبوویەوە، وە بەو شێوەیە بوون پەنجەکانی کردە ناویەکتری) .

هەستام بۆ لای و ووتم : چی بکەم لەوکاتەدا ئەی رسول الله ﷺ؟ الله تعالى بمکات بە قوربانت .

فەرمووی : (لە ماڵەکەت بمێنەوە، وە زمانت بگرە، وە دەست بەوەوە بگرە کە دەیزانیت، وە وازبهێنە لەوەی کە پێی ڕازی نیت، وە خەریکی کاری تایبەتی خۆتبە، وە وازبهێنە لە کاری عاممەی خەڵکی) .

**١٢** - عن عُقبه بن عامر رضي الله عنه، قال: قلت: يا رسول الله ما النجاة؟ قال: (املك عليك لسانك، وليسعك بيتك، وابك على خطيئتك).

واته: عُقبەی کوڕی عامر دەڵێت: ووتم ئەی رسول الله ﷺ ڕزگار بوون چۆنە؟

فەرمووی: (زمانت بپارێزە، لە ماڵەکەت بمێنەوە، وە لەسەر تاوانەکانت بگری).

**١٣** - عن عبدالله بن عمرو رضي الله عنهما، عن النبي ﷺ قال: (كيف بكم وزمان يغربل فيه الناس غربلة، تبقى حُثاله من الناس، فإذا كان ذلك فخذوا ما تعرفون، وذروا ما تُنكرون، وأقبلوا على خاصَّتِكم، وذروا أمرَ العوام).

واته: (دەبێت ئێوە چۆن بن لە زەمانێکدا کاتێك خەڵکی لە بێژینگ دەدرێت، خەڵکە پاشماوە و خڵتەکە دەمێنێتەوە، جا ئەگەر ئەوکاتە هات ئەوا دەست بەوەوە بگرە کە دەیزانیت، وە وازبهێنە لەوەی کە پێی ڕازی نیت، وە خەریکی کاری تایبەتی خۆتبە، وە وازبهێنە لە کاری عاممەی خەڵکی).

**١٤** - له عبدالله ی كوڕی عمرو رضي الله عنهما ، رسول الله ﷺ پێی ووتم : (دەبێت حاڵت چۆن بێت ئەی عبداللّەی كوڕی عَمرو، ئەگەر بمێنیتەوە لەناو پاشماوەی خەڵكی؟) .

ووتیان : ئەی رسول الله ﷺ، چی بكەین ئەگەر بەوشێوەیە بوو؟

فەرمووی : (ئەگەر خەڵكیت بینی كەوا بەڵێن و ئەمانەتەكانیان دەشكاند و نەیاندەبردە سەر، وە جیاوازبوون و بەو شێوەیە بوون .

پەنجەكانی كردە ناویەكتری) .

ووتی : وتی : ئەی رسول الله ﷺ، فەرمانی چیم پێدەكەیت؟

فەرمووی : (فەرمانت پێدەكەم كەوا لە الله تعالى بترسیت، وە دەست بەووەوە بگرە كە دەیزانیت، وە وازبهێنە لەوەی كە پێی ڕازی نیت، وە خەریكی كاری تایبەتی خۆتبە، وە وازبهێنە لە كاری عاممەی خەڵكی) .

**١٥** - له ئەبو هریرەوە رضي الله عنه، دەڵێت : رسول الله ﷺ به عبدالله ی كوڕی عمرو رضي الله عنهما فەرمووو : (دەبێت حاڵت چۆن بێت ئەی عبداللّەی كوڕی عمرو، ئەگەر بمێنیتەوە لەناو پاشماوەی خەڵكی، بەڵێن و ئەمانەتەكانیان دەشكاند و نەیان دەبردە سەر، وە جیاوازبوون و بەو شێوەیە بوون .

پەنجەكانی كردە ناويەكتری) .

ووتی : ووتم : ئەی رسول الله ﷺ، فەرمانی چیم پێدەكەیت؟

فەرمووی : (خەریكی كاری تایبەتی خۆتبە، وە وازبهێنە لە كاری عاممەی خەڵكی) .

**١٦** - عن أم سلمه رضي الله عنها : أن النبي ﷺ استيقظ ذات ليله فرفع رأسه إلى السماء ، فقال : (ماذا نزل الليلة من الفتن، وماذا فتح الليلة من الخزائن، أيقظوا صواحبات الحُجر، فربّ كاسيه في الدنيا عاريه يوم القيامة) .

واتە : أم سلمة رضي الله عنها دەفەرمووێ شەوێكیان رسول الله ﷺ لەخەو هەستا، جا سەری بەرزكردەوە بۆ ئاسمان و فەرمووی : (چەند فیتنە لەم شەودا دابەزیوە، وە چەند گەنجینە كرانەوە ئەو شەو، ئەی ئافرەتانی ناو حوجرەكان لە خەو هەستن [بۆ نوێژ]، كەسێكی داپۆشراو لە دونیادا لەوانەیە رووت بێت لە دوارۆژدا) .

**١٧** - عبدالصمدی كوڕی زیاد دەڵێت : بیستم فضیل ی كوڕی عیاض دەیووت : لە كۆتا زەماندا بمێننەوە لە الصوامع .

ووتمان : صوامع چییە؟

ووتی : ماڵەکان، بێگومان هیچ کەسێك نییە ڕزگاری بێت لە خراپەی ئەو زەمانە ئیللا کەسێ کە هەڵگری باشترین ڕەوشت بێ **[واتە ئەوەندە کەس و دەوروبەر و ژینگەی خراپەکار بوونی دەبێت کە زۆر کەم خەڵك لێی ڕزگار دەبێت، ئەوانیش ئەوانەن کە خاوەن ڕەوشت و بەهایەکی بەرزن]** .

**١٨** - حذیفە رضي الله عنه دەڵێت : خۆزگە کەسێکم دەدۆزیەوە بە کاروباری ماڵم هەڵبستایە، ئینجا بچووبامایە ماڵەکەمەوە و دەرگام لەسەرخۆم داخستبا و هیچ کەسێك نەهاتبا بۆلام بە هیچ شێوەیەك، وە دەرنەچووبام بۆلای هیچ کەسێك هەتاوەکو دەگەیشتمەوە بە الله تعالی .

**١٩** - عبداللەی کوڕی عمرو رضي الله عنهما ، دەفەرمووێت : خۆشەویسترین شتێك لەلای الله تعالی نامۆکانن .

ووترا : نامۆکان کێن؟

ووتی : ئەوانەی ڕادەکەن بە دینەکەیانەوە، حەشر دەکرێن لەگەڵ عیسای کوڕی مریم علیهم السلام لە ڕۆژی قیامەتدا .

٢٠ - عن عبدالله بن مسعود رضي الله عنه قال : قال رسول الله ﷺ : (إن الإسلام بدأ غريبًا، وسيعود غريبًا كما بدأ، فطوبى للغرباء) .

قيل : من هم يا رسول الله ﷺ ؟

قال : (الذين يصلحون إذا فسد الناس) .

واته : (بەڕاستی ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێکرد، وە نامۆ دەبێتەوە وەکو چۆن دەستی پێکرد، جا خۆشبەختی بۆ نامۆکان) .

ووترا : ئەوانە کێن ئەی رسول الله ﷺ ؟

فەرمووی : (ئەوانەی کەوا چاکسازی دەکەن کاتێ خەڵکی خراپەکاری دەکەن) .

٢١ - لە زبیری کوڕی عدي یەوە، دەڵێت : سکاڵامان برد بۆ لای ئەنەسی کوڕی مالك رضي الله عنهما لەوەی پێمان دەگەیشت لە بارەی حجاج .

جا ووتی : ئارامبگرن، چونکە بەڕاستی (هیچ کاتێکتان بەسەردا نایەت ئیللا ئەوەی لەدوای دێت ناخۆشتر و زەحمەتترە لەو، هەتا دەگەنەوە بە پەروەردگارتان عزَّوَجَل)، ئەوەم بیست لە پێغەمبەرەکەتان ﷺ .

**٢٢** - ئەنەسی كوڕی مالك رضي الله عنه، دەفەرمووێ : هیچ ڕۆژ شەو و مانگ و ساڵێك نییە ئیللا ئەوەی پێشی باشتر و خۆشترە لەو .

ئەوەم بیست لە پێغەمبەرەكەتان ﷺ .

**٢٣** - لە زوبەیری كوڕی عدي هەمەدانییەوە، دەڵێت : هاتین بۆ لای ئەنەسی كوڕی مالك رضي الله عنه سكاڵامان كرد لەلای ئەو لە بارەی حجاج .

جا ووتی : ئارامبگرن، چونكە بەڕاستی (هیچ ڕوژێك یان كاتێكتان بەسەردا نایەت ئیللا ئەوەی لەدوای دێت خراپترە لەو، هەتا دەگەنەوە بە پەروەردگارتان عزَّوَجَل)، بیستم لە پێغەمبەرەكەتان ﷺ .

**٢٤** - قال رسول الله ﷺ : (يذهب الصالحون الأول فالأول، حتى يَبقى مثل حُفاله التمر والشعير، لا يُبالي الله عزَّوَجَل بهم) .

واتە : (پیاوچاكان دەمرن یەك لەدوای یەك، هەتاوەكو دەمینێتەوە پاشماوەی كۆمەڵگا وەكو پاشماوەی خورما و جۆ، الله عزَّوَجَل گرنگیان پێنادات) .

**٢٥** - عن أنس رضي الله عنه، قال: قال رسول الله ﷺ: (لا يزداد الأمر إلّا شدَّة، ولا الدنيا إلا إدبارًا، و لا الناس إلا شُحًّا، ولا تقوم الساعه إلَّا على شرار الناس، ولا مهدي إلَّا عيسى ابن مريم).

واته: (پەیوەست بوون بە دینەوە زەحمەتتر دەبێت و کاروباری دونیا قورستر دەبێت، دونیا تیادەچێت و زوو بەرەو کۆتایی دەڕوات، وە خەڵکی زیاتر بەخیل و چاوچنۆك دەبن، وە قیامەت هەڵناستێت تەنها لەسەر خراپترینی خەڵکی نەبێت، هیچ ڕزگارکەرێ نییە ئیللا عیسى بن مريم عليهما نەبێت [واتە گەورەترین ڕزگارکاری خەڵکیە لە فیتنەی دەجال والله اعلم]).

**٢٦** - قال رسول الله ﷺ: (إن الناس اليوم كشجره ذات جنى، ويوشك أن يعود الناس كشجره ذات شوك، إن نافذتهم نافذوك، وإن تركتهم لم يتركوك، وإن هربت منهم طلبوك).

قالوا: يا رسول الله، وكيف المخرج من ذلك؟!

قال: (تقرضهم من عرضك ليوم فقرك).

واته: (بەڕاستی خەڵکی ئەمڕۆ وەکو دارێکن کە بەری هەبێت، وە نزیکە کە خەڵکی بگەڕێنەوە بۆ دارێك کە دڕکی هەبێت، ئەگەر پێیانەوە بیت پێتەوە دەدەن [وەك چۆن بتەوێت دەست لە دارێك بدەیت کە دڕکی هەبێ

لەپێشدا دڕکەکە دەچێت بەدەستت]، ئەگەر وازیان لێبهێنیت ئەوان هەر وازت لێناهێنن، وە ئەگەر ڕاکەیت ئەوان هەر دوات دەکەون) .

هاوەڵان ووتیان : ئەی رسول الله ﷺ، ڕێگە چارە چییە لەو کاتەدا؟

فەرمووی : (شتەکانی خۆتیان پێ بدە بۆ ئەو ڕۆژەی کە پێویستە [مەبەستی ڕۆژی قیامەتە] ) .

**٢٧** - کعب الأحبار رحمه الله دەڵێت : بەڕاستی بۆ هەموو سەردەمێک الله تعالى پاشایەك دەنێرێ لەسەر دڵی ئەهلەکەی، جا ئەگەر الله تعالى ویستی چاکەی هەبێت بۆ قەومێك، چاکەکارێك لەناویان دەنێرێ [دەیکات بە پاشا والله اعلم]، وە ئەگەر ویستی لەناوچوونی هەبێت بۆ قەومێك، کەسێکی یاخیان بۆ دەنێرێ، پاشان خوێندیەوە : ﴿وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا﴾، [الإسْرَاء : ١٦]

## ٢ - له نيشانەکانی فیتنە

**٢٨** - له قتادە وە ، دەڵێت : ئەنەسی کوڕی مالك رضي الله عنه پێی ووتین : فەرمووده‌یه‌کتان بۆ دەگێڕمەوە کە هیچ کەسێك نەدۆزنەوە بۆتان بگێڕێتەوە لە دوای من، بیستم رسول الله ﷺ فەرمووی : (إن من أشراط الساعه : أن يذهب العلم، ويظهر الجهل) .

واته : (بەڕاستی لە نیشانەکانی رۆژی دوایی ئەوەیە کە : زانست هەڵدەگیرێتەوە و نامێنێ، وە نەزانی بڵاو دەبێتەوە) .

**٢٩** - عن عبدالله بن مسعود رضي الله عنه : أن رسول الله ﷺ قال : (لا تقوم الساعه حتى يسود كل قبيله منافقوها) .

واته : (قیامەت هەڵناستێت هەتاوەکو هەموو هۆزێك دووڕووەکەی پێشەوایەتی دەکات) .

**٣٠** - عمروی کوڕی قیس دەڵێت، بیستم عبداللهی کوڕی عەمرو رضي الله عنهما ووتی : بەڕاستی لە نیشانەکانی ڕۆژی قیامەت : باشەکان دەمرن و خراپەکان دەردەکەون و وەهەموو هۆزێك دووڕووەکەی پێشەوایەتی دەکات .

**٣١** - عن أنس بن مالك رضي الله عنه، سمع رسول الله ﷺ يقول : (إن من أشراط الساعه، أن يقلَّ الرجال، ويكثر النساء، حتى يكون قيم خمسين امرأه رجل واحد) .

واتە : (بەڕاستی لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە : ژمارەی پیاو کەم دەبێتەوە، وە ژمارەی ئافرەت زیاد دەکات، هەتاوەکو پەنجا ئافرەت چاودێری دەکرێ لەلایەن یەك پیاو) .

**٣٢** - عبدالله بن عمرو رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە باشەکان بهێنرێنە خوارەوە، وە خراپەکاران بەرز بکرێنەوە، وە هەموو هۆزێک بەڕێوەببرێت لەلایەن موونافیقەکەیانەوە) .

**٣٣** - علي كوڕی أبو طالب رضي الله عنه دەفەرموویت : (نزیكە سەردەمێك دابێت بەسەر خەڵكی، نامێنێتەوە لە ئیسلام تەنها ناوەكەی نەبێ، وە نامێنێتەوە لە قورئان تەنها شێوەكەی نەبێ، مزگەوتەكانیان ئەو ڕۆژە ئاوەدانە بەڵام كاولە بۆ هیدایەت، زاناكانیان خراپترینی خەڵكی ژێر ئاسمانن، فیتنە لەوانەوە دەردەچێ و بۆ ئەوان دەگەڕێتەوە) .

**٣٤** - عمر ی كوڕی خطاب رضي الله عنه دەفەرمووێ : (سەردەمێك بەسەر خەڵكی دادێت باشترینی ناویان ئەوانەن كە بۆ نەفسی خۆیان باشن، ئەگەر تووڕەبن بۆ نەفسی خۆیان تووڕە دەبن، وە ئەگەر ڕازی بن بۆ نەفسی خۆیان ڕازی دەبن، تووڕە نابن بۆ الله عزَّوَجَل، وە ڕازی نابن بۆ الله عزَّوَجَل، جا ئەگەر ئەوكاتە هات ئەوا خۆتان بپارێزن لە خەڵكی بە گومانی خراپ **[والله اعلم مەبەستی گومانێك لەشوێنی خۆی بێت]** ) .

**٣٥** - باوكی ئومەییەی الشعباني، دەڵێت : پرسیارم كرد لە باوكی ثعلبة الخشني رضي الله عنه لەبارەی ووتەی الله تعالى : ﴿**يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ**﴾ [المَائدة : ١٠٥]

جا ووتی : پرسیارم لە کەسێکی زۆر شارەزا کرد، پرسیارم کرد لە رسول الله ﷺ دەربارەی ئەو ئایەتە وەکو چۆن تۆ پرسیارت لە من کرد .

جا فەرمووی : بەڵکو فەرمان دەکەن بە چاکە، وە ڕێگری دەکەن لە خراپە، هەتاوەکو دەبینیت چاوچنۆکێکی گوێڕایەڵیکەر، وە شوێنکەوتووی هەواو ئارەزوو، وە دونیایەکی هەڵبژێردراو، وە سەرسامبوونی هەموو خاوەن ڕەئیەك بە ڕەئیەکەی، جا پێویستە خەریکی نەفسی خۆت بیت وە وازبهێنە لە عاممەی خەڵکی، چونکە بەڕاستی لە پێشتانەوە ڕۆژانێك هەیە ئارامگرتن تێیدا وەکو دەست گرتنە بە پشکۆیەك ئاگرەوە، بۆ ئەو کەسانەی کاری چاکە دەکەن لەوان وەکو پاداشتی پەنجا کەسە کە هەمان کاری ئەو دەکەن .

**٣٦** - أبي عاليه رحمه الله دەڵێت : لەنێوان دووپیاودا کە لەلای عبداللەی کوڕی مسعود بوون شتانێك هەبوو کە لەنێوان خەلکی دی نەبوو، هەتاوەکو هەریەك لەو دووانە هەستان بۆلای هاوەڵەکەی خۆی، جا پیاوێك بە عبداللەی کوڕی مسعودی رضي الله عنه ووت : ئەگەر بچیت بۆلای ئەو دوو پیاوە و فەرمانت پێبکردبان و ڕێگریت لێبکردبان؟

جا پیاوێك ووتی : خەریكی نەفسی خۆت بە ، الله تعالی دەفەرمووێت :
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ﴾، [المائدة : ١٠٥] .

عبداللەی كوڕی مسعود رضي الله عنه ئەوەی بیست و جا ووتی : تەفسیری ئەو ئایەتە نەهاتووەتە جێ هێشتا، بێگومان قورئان دابەزی بەسەر پێغەمبەر ﷺ، ئایەتانێكی تێدایە تەفسیرەكانی هاتووەتەجێ لەكاتی دابەزینی ئایەتەكە، وە ئایەتانێكی تێدایە تەفسیرەكانی هاتووەتە جێ و ڕوویدا لەسەردەمی رسول الله ﷺ، وە ئایەتانێكی تێدایە تەفسیرەكەی دێتە جێ و ڕوودەدات لە ڕۆژی قیامەت، وە ئەوەی باسكراوە لە ڕووداوەكانی ڕۆژی قیامەت، ئایەتانێكی تێدایە تەفسیرەكەی دێتەجێ ڕۆژی قیامەت لە بەهەشت و دۆزەخ، وە لێپێچینەوە و تەرازوو، جا مادام دڵتان یەكە، وە ئارەزووتان یەكە، نەبوونەتە چەند دەستە و تاقمێك، وە هەندێكتان ئازار و جەزرەبەی هەندێكتانی نەداوە، ئەوا فەرمان بكەن بە چاكە و ڕێگری بكەن لە خراپە، جا كاتێك دڵتان و ئارەزووەكانتان جیاوازبوون، وە بوونە چەند دەستە و تاقمێك، وە هەندێكتان ئازار و ئەشكەنجەی هەندێكتانی دا ئەوا لەو كاتەدا تەفسیری ئەو ئایەتە دێتەجێ، جا فەرمان بكە بە نەفسی خۆت .

**٣٧** - له عطائی كوڕی أبي رباحه‌وه، له عبدالله‌ی كوڕی عومه‌ره‌وه رضي الله عنهما، ده‌فه‌رمووێ : له‌گه‌ڵ ده و ئه‌وه‌نده بووم له مزگه‌وتی رسول الله : ئه‌بو بكر، عمر، عثمان، علي، وه عبدالله‌ی كوڕی مسعود، وه موعاذی كوڕی جبل، وه حوذه‌یفه‌ی كوڕی یه‌مان، وه عبدالرحمن ی كوڕی عه‌وف، وه ئه‌بو سه‌عید، وه عبدالله‌ی كوڕی عمر، رسول الله ﷺ ڕووی كرده ئێمه و فه‌رمووی : ئه‌ی كۆمه‌ڵی كۆچكاران، پێنج شت ئه‌گه‌ر پێی تاقیبكرێنه‌وه، وه په‌نا ده‌گرم به الله له‌وه‌ی بژین تاوه‌كو پێی بگه‌ن و ببینن، فاحیشه‌و داوێن پیسی به‌ده‌رناكه‌وێت له‌ناو قه‌ومێك هه‌تا وای لێدێت به ئاشكرا ئه‌نجامی بده‌ن، ئیللا تاعون و برسییه‌تیه‌ك كه هه‌رگیز له باوانیانه‌وه نه‌زانرابێ بڵاوده‌بێته‌وه له‌ناویان، وه فروفێڵ ناكه‌ن له كێشان و پێوانه ئیللا تووشی گرانی و قاتو قڕی دێن، وه به‌ڵا و موسیبه‌تی توند و زۆڵم و سته‌می ده‌سه‌ڵاتداره‌كانیان، وه ڕێگری له ده‌ردانی زه‌كاته‌كانیان ناكه‌ن ئیللا باران ده‌گیرێته‌وه له ئاسمان، وه ئه‌گه‌ر ئاژه‌ڵه‌كان نه‌بوونایه بارانیان بۆ نه‌ده‌باری، وه ئه‌و په‌یمان و به‌ڵێنه‌ی كه داویانه به الله تعالى وه پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی ﷺ هه‌ڵیناوه‌شێننه‌وه ئیللا الله تعالى دوژمنه‌كانیان به‌سه‌ردا زاڵ ده‌كات، وه مه‌گه‌ر پێشه‌واكانیان كاربكه‌ن به‌پێی كتابی الله تعالى وه داوای هه‌موو شتێكی باش ده‌كه‌ن له‌وه‌ی كه‌وا الله عزَّوَجَل دایبه‌زاندووه، ئیللا الله عزَّوَجَل العظیم وایان لێده‌كات كه‌وا له‌گه‌ڵ یه‌كتری بجه‌نگن .

**٣٨** - له حه‌سه‌نی به‌صرییه‌وه رحمه الله ، ده‌ڵێت : رسول الله ﷺ ده‌فه‌رمووێ : به‌رده‌وام ئه‌م ئوممه‌ته له‌ژێر ده‌ستی الله تعالی دایه وه له‌ژێر ستری دایه هه‌تاوه‌كو قورئان خوێنه‌كانیان مه‌یلیان نه‌بێ بۆ ده‌سه‌ڵاتداره‌كانیان، وه چاكه‌كانیان ته‌زكیه‌ی خراپه‌كارانیان نه‌كه‌ن، وه هه‌تاوه‌كو باشترینه‌كانیان جنێو نه‌ده‌ن به خراپترینه‌كانیان، جا كاتێك ئاوایان كرد، الله ی به‌خشنده ده‌ستی خۆی به‌رز ده‌كاته‌وه له‌سه‌ریان، پاشان زاڵم زۆرداره‌كانیان به‌سه‌ردا زاڵ ده‌كات تووشی خراپترین سزایان ده‌كه‌ن، وه تووشی هه‌ژاری و نه‌داریان ده‌كات، وه دڵیان پڕ له ترس و بیم ده‌كات .

## ٣ - فەرمانکردن بە ئارامگرتن لە ڕۆژی فیتنەدا

**٣٩** - معاويە رضي الله عنە دەڵێت، بیستم رسول الله ﷺ دەفەرمووێ :
(لم يبق من الدنيا إلَّا بلاء وفتنة، فأعدوا للبلاء صبرًا) .

واتە : (نەماوەتەوە لە دونیادا تەنها بەڵاو تاقیکردنەوە نەبێ، جا ئارامگرتن بۆ بەڵا و موسیبەتەکان ئامادەبکەن) .

**٤٠** - بۆی گێڕاینەوە أبو عبد ربە، دەڵێت : بیستم معاويە رضي الله عنە لەسەر ئەو مینبەرە دەیووت، بیستم رسول الله ﷺ فەرمووی : (إن ما بقي من الدنيا بلاء وفتنة، فأعدوا للبلاء صبرًا) .

واتە : (نەماوەتەوە لە دونیادا تەنها بەڵاو تاقیکردنەوە نەبێ، جا ئارامگرتن بۆ بەڵا و موسیبەتەکان ئامادەبکەن) .

## ٤ - هاندان لەسەر کەمی منداڵ لە کاتی فیتنە

**٤١** - لە حذیفەوە رضي الله عنه، کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (قیامەت هەڵناستێت هەتاوەکو باوکی پێنج مناڵ ئاوات دەخوازێت کەوا چواری هەبوایە، وە باوکی چوار منداڵ سێی هەبوایە، وە باوکی سێ منداڵ دووی هەبوایە، وە باوکی دوو منداڵ یەکی هەبووایە، وە باوکی یەك منداڵ ئاوات دەخوازێت کەوا هەر منداڵی نەبووایە) .

**٤٢** - لە حذیفەوە رضي الله عنه، کە وا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (قیامەت هەڵناستێت هەتاوەکو باوکی پێنج مناڵ ئاوات دەخوازێت کەوا چواری هەبوایە، وە باوکی چوار منداڵ سێی هەبوایە، وە باوکی سێ منداڵ دووی هەبوایە، وە باوکی دوو منداڵ یەکی هەبووایە، وە باوکی یەك منداڵ ئاوات دەخوازێت کەوا هەر منداڵی نەبووایە) .

**٤٣** - عبداللەی کوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : (بێگومان سەردەمێك دێت بەسەرتاندا ئەگەر یەکێکتان ببینێ کەوا مردن دەفرۆشرێ ئەوا دەیکڕێ، وە زەمانێکتان بەسەر دادێ پیاو حەسودی دەبات

به كه‌سێك پشتی سووكه له خاو و خێزان وه‌كو چۆن حه‌سوودی ده‌بردرێ به زۆری ماڵ و منداڵ) .

## ٥ - پاڕانەوە لە الله تعالى لە ڕۆژانى فيتنە : کەوا بيگێڕێتەوە بۆ لاى خۆى بێ ئەوەى تووشى فيتنە ببێت

**٤٤** - عبدالرحمن ى کوڕى عايش دەڵێت : بيستم رسول الله ﷺ فەرمووى : (پەروەردگارم عزَّوَجَل بينى لە جوانترين وێنەدا، پێى فەرمووم :

دەربارەى چى فريشتە بەرزەکانى ئاسمان گفتوگۆ دەکەن ئەى محمد؟

ووتم : تۆ زاناترى ئەى پەروەردگارم،

فەرمووى : دەربارەى چى فريشتە بەرزەکانى ئاسمان گفتوگۆ دەکەن؟

ووتم : تۆ زاناترى ئەى پەروەردگارم .

دەفەرمووێت : جا دەستى لەنێوان شانەکانمدا دانا، هەتاوەکو ئەوەى لە ئاسمانەکان و ئەوەى لە زەويدا بوو بۆم ئاشکرا بوو، پاشان ئەم ئايەتەى خوێندەوە : ﴿**وَكَذَلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ**﴾ [**الأنعام** : ٧٥]

پاشان پێى فەرمووم : ئەى محمد، دەربارەى چى فريشتە بەرزەکانى ئاسمان گفتوگۆ دەکەن؟

ووتم : لە الدرجات، فەرمووى : وە الدرجات چييە؟

ووتم : بەپێ ڕۆیشتن بۆ نوێژی جەماعەتەکان، وە دانیشتن لە مزگەوتەکان لەدوای نوێژەکان، وە دەستنوێژگرتن لەکاتە سەختەکاندا .

فەرمووی : دەربارەی چی تر ؟

ووتم : دەربارەی الكفارات **[ئەوکارانەی ئەبنە هۆی سڕینەوەی تاوان]** .

فەرمووی : الكفارات چیە ؟

ووتم : خواردن بەخشین، وە بڵاوکردنەوەی سەلام، وە نوێژکردن بەشەو لەکاتێکدا خەڵك خەوتوون .

فەرمووی : بڵێ : (اللهم إني أسالك فعل الحسنات، وترك المنكرات، وحب المساكين، وأن تتوب علي، وتغفر لي، وترحمني، وإذا أردت بقوم فتنة فتوفني وأنا غير مفتون) .

ئەی پەروەردگارم داوای کردەوە چاکەکانت لێدەکەم، وە وازهێنان لە خراپەکان و خۆشویستنی هەژارەکان، وە تەوبە کردن بۆلات، وە لێم خۆش بیت و ڕەحمم پێ بکەی، وە کاتێك ویستت خەڵکی تاقی بکەیتەوە بمرێنە بەبێ ئەوەی توشی فیتنە ببم .

رسول الله فەرمووی : جا فێری بن سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە ئەو ووشانە حەقن) .

## ٦ - حەسوودی بردن بە مردووەکان و ئاوات خواستن بە مردن لە کاتی دەرکەوتنی فیتنە لە ترسی لەدەستدانی دین

**٤٥** - باوکی عبد ربە دەڵێت، کەوا ئەبو درداء ئەگەر هەواڵی مردنی کەسێکی بۆ بهاتایە لەسەر حاڵی چاکە دەیووت : پیرۆزی بێت، خۆزگە لەشوێنی ئەوبام .

جا أم درداء پێی ووت : کاتێ هەواڵی کەسەکەت پێگەیشت ووتت : خۆزگە لەشوێنی ئەوبام .

أبو درداء ووتی : دەزانیت کەوا پیاو بەیانی ئیماندارە و کە ئێوارە دەکاتەوە کافرە؟

ووتی : چۆن؟

ووتی : ئیمانەکەی لەدەست دەدات و ئەو هەستیشی پێناکات، بۆیە حەسوودی بە مردنی ئەوکەسە دەبەم [کە لەسەر ئیسلام و سوننەت مردووە] زیاتر لەو کەسەی کە نوێژکەر و ڕۆژووگرە .

**٤٦** - له عبد الله بن عمرو رضي الله عنهما، عن النبي ﷺ، قال : (تُحْفهُ المؤمنِ : الموت) .

واته : (دیاری ئیماندار مردنه) .

**٤٧** - له یەحیی کوڕی ئەبو کثیر ەوە، دەڵێت : چوومە لای ئەبو سلمة ی کوڕی عبدالرحمن رضي الله عنه وە ئەو نەخۆش بوو جا ووتی : ئەگەر توانیت بمریت ئەوا بمرە، چونکە سوێند بە الله تعالی سەردەمێك دێت بەسەر خەڵکیدا لەلای یەکێکیان مردن خۆشەویستره لە زێڕی سوور .

**٤٨** - عن أبي هريره رضي الله عنه، قال : قال رسول الله ﷺ : (ويل للعرب من شرِّ قد اقترب، موتوا إن استطعتم) .

واته : (وەیل بۆ عەرەب لەو شەڕەی کەوا نزیك بووەتەوە، بمرن ئەگەر لەتواناتاندا هەبوو) .

**٤٩** - عن أبي هريره رضي الله عنه ، قال : قال رسول الله ﷺ : (لا تقوم الساعه حتى يمرّ الرجل بقبر الرجل فيقول : يا ليتني مكانك) .

واتە : (قیامەت هەڵناستێت هەتاوەکو پیاو دەڕوات بەلای گۆڕێکدا جا دەڵێت : خۆزگەم بە شوێنەکەت) .

٥٠ - کمیل ی کوڕی زیادی النخعي دەڵێت : بیستم عبداللە ی کوڕی مسعود فەرمووی : بێگومان سەردەمێك دێت بەسەرتاندا ئەگەر یەکێکتان ببینێ کەوا مردن دەفرۆشرێ ئەوا دەیکڕێ، وە زەمانێکتان بەسەردادێ پیاو حەسودی دەبات بە کەسێك پشتی سووکە لە خاو و خێزان وەکو چۆن حەسوودی دەبردرێ بە زۆری ماڵ و منداڵ .

٥١ - عن سهل بن سعد الساعدي رضي الله عنه ، قال : قال رسول الله ﷺ : (اللهم لا يُدركني زمان ولا أدركه، لا يتبع فيه العالم، ولا يستحيي فيه الحليم، قلوبهم قلوب العجم، وألسنتهم ألسنة العرب) .

واتە : (ئەی پەروەردگار نەمگەیەنیت بە سەردەمێك وە نەگەم پێی، کە تیایدا کەس شوێنی زانا ناکەوێت، وە تیایدا شەرم ناکرێ لە کەسی نەرم و نیان و لەسەرخۆ، دڵەکانیان دڵی عەجەمە [واتە دڵیان پڕە لە ڕیا و دووڕوویی، والله اعلم]، وە زمانیشیان زمانی عەرەبە) .

**٥٢** - له میمون ی كوڕی مهران ـهوه : كـهوا ڕاهیبێك چووه ژوورەوه بۆلای عمری كوڕی عبدالعزیز رحمه الله جا عمر پێی ووت : ئایا هەواڵ نەدرا كه تۆ بەردەوام دەگریت، جا بۆچی ئەو گریانه؟

ڕاهیبەكه ووتی : بەڕاستی من ئەی پێشەوای ئیمانداران پەیمانم وەرگرت له خەڵكی وه هیچ شتێك به نرختر نەبوو لەلایان له دینەكەیان، وه ئەمڕۆ هیچ شتێك به نرختر نییه له دونیایان، جا زانیم كەوا ئەمڕۆ مردن باشتره بۆ كەسی باش و خراپ .

میمون ووتی : كاتێك ڕاهیبەكه چووه دەرەوه، عمر ووتی : ڕاهیبەكه ڕاستی ووت ئەی باوكی ئەیوب .

**٥٣** - له زاذان ـهوه دەڵێت : دانیشتبووم لەگەڵ عبس الغفاري، جا خەڵكی بینی شتومەكیان هەڵدەگرت [بۆ جێهێشتنی ئەو شوێنه]، جا ووتی : ئەوه خەڵكی چییانه؟

ووتی : له طاعون ڕا دەكەن .

ووتی : ئەی طاعون بمبه بۆلای خۆت .

برازایەكی پێی ووت : ئەی مامه، لەبەرچی ئاواتی مردن دەخوازیت له كاتێكدا بیستووته رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : (با هیچ یەكێك له ئێوه

ئاواتی مردن نەخوازێ چونکە بەڕاستی مردن لەگەڵ بڕانەوەی ئەجەلەکەیەتی)؟

جا ئەویش ووتی : چەند تایبەتمەندییەك کە بیستوومە رسول الله ﷺ ئوممەتەکەی دەترسێنێت لەوەی پێی بگەن : (دەسەڵاتداری منداڵ، وە زۆری پۆلیس و شوڕتە، وە خواردنەوەی عەرەق، وە فرۆشتنی حوکم و قەزاوەت [بە واستە و بەرتیل]، وە پچڕاندنی سیلەی ڕەحم، وە دەرکەوتنی گەنجانێك کە قورئان دەخوێننەوە لەسەر ئاوازی مۆسیقا و گۆرانی، پێشیان دەخەن بۆ نوێژ کە فەقیهترینیان نییە تەنها بۆ ئەوەی قورئانیان بۆ بخوێننەوە لەسەر ئاوازی مۆسیقا و گۆرانی) .

[محمدی کوڕی حسین] وتم : فەرمووده و ئەثەری زۆر هەیە لە کتابی (التفرد والعزلة) ئەگەر بتەوێ بیخوێنیتەوە لەبەر لێکچوونی نێوان دوو باب ەکە، چونکە بەڕاستی گۆشەگیری و خۆجیاکردنەوە لە خەڵکی لە ئەنجامی زۆری فیتنە و بەڵاکان ڕوودەدات، داوا دەکەین لە الله تعالی کە بمانپارێزێ لە فیتنە ئەوەی دیارە و ئەوەی شاراوەیە، وە حەقمان پیشانبدات و شوێنکەوتنیمان بە نسیب بکات، وە باتڵمان پیشان بدات و دوورمان بخاتەوە لێی .

# ٧ - له فیتنەکان : دەرچوون له سوڵتان و وازهێنان له گوێڕایەڵی بۆی

**٥٤** - عبدالرحمن ی کوڕی عمرو السلمي و حجر الكلاعي، دەڵێن : چووینه لای عرباضی کوڕی سارية وه ئەو لەوانەیه کە ئەو ئایەتە لەبارەیانەوە دابەزی : ﴿**وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّواْ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا**﴾ [**التوبة** : ٩٢] .

وه ئەو نەخۆش بوو، ووتم : ئێمە هاتووینە بۆلای تۆ بەسەردانیکردن و گەڕانەوە و سوود وەرگرتن .

جا عرباض ووتی : بێگومان رسول الله ﷺ نوێژی بەیانی بۆ کردین پاشان ڕووی کردە ئێمە و ئامۆژگاری کردین بە ئامۆژگارییەکی زۆر جوان، چاوەکان فرمێسکیان پێدا هاتە خوارەوە، وە دڵەکان کەوتنە لەرزین لە ترسان، جا یەکێك ووتی : ئەی رسول الله ﷺ، بەڕاستی ئەوە ئامۆژگاری کەسێکی ماڵئاواییکارە جا پەیمانی چیمان لێوەردەگری؟

رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئامۆژگاریتان دەکەم بە لە الله ترسان و بیستن و گوێڕایەڵی، ئەگەرچی بەندەیەکی حەبەشی بێت، جا بەڕاستی هەریەك لە ئێوە

بژی لەدوای من ئەوا جیاوازییەکی زۆر دەبینێ، جا دەست بگرن بە سوننەتی من، وە سوننەتی جێنشینە ڕاشیدینە مەهدییەکان، قەپی پێ بگرن بە ددانەکانتان، وە ئاگاداربن لە شتە تازە داهێنراوەکان، چونکە هەموو تازە داهێنراوێك بیدعەیە و هەموو بدعەیەکیش گومڕاییە).

**٥٥** - عن أبي أُمامه الباهلي رضي الله عنه، عن النبي ﷺ أنه قال: (اسمعوا لهم وأطيعوا في عُسركم ويسركم، ومنشطكم و مكرهكم، وأثره عليكم، ولا تنازعوا الأمر أهله، وإن كان لكم).

واتە: (ببیستن و گوێڕایەڵیان بکەن لە خۆشیتان و ناخۆشیتان، وە ئەوەی بەدڵتانە و ئەوەی ڕقتان لێیە، ئەگەرچی دەسەڵاتداران مافەکانی خۆتان پێ نەدەن، وە مشتومڕی بڕیارەکانی مەکەن، تەنانەت ئەگەر لە ئێوەش بوو).

**٥٦** - ئەنەسی کوڕی مالك رضي الله عنه دەفەرمووێ: گەورەکان لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ ڕێگریان لێدەکردین لە جنێودان بە ئەمیرەکان.

**٥٧** - معاذی كوڕی جبل رضي الله عنه دەفەرمووێ : (ئەمیر لە ئەمری الله تعالی، جا هەركەسێك تانە بدات لە ئەمیر ئەوا بێگومان تانە دەدات لە فەرمانی الله تعالی) .

**٥٨** - أبو اسحاق دەڵێت : (هیچ گەلێك جوێن نادەن بە ئەمیرەكەیان ئیللا بێ بەشدەبن لە خێرەكەی) .

**٥٩** - عبادەی كوڕی نسي دەڵێت : (ئەبو درداء رضي الله عنه ڕاوەستا لەسەر دەرگای معاویە رضي الله عنه، جا ڕێگری كرد لە هاتنە ژوورەوەی لەبەر چەند ئیشەك كە هەیبوو، ئەبو درداء وەكو ئەوەبوو شتێكی بینی لە نەفسی خۆی، بۆیە ووتی : هەركەسێك بێتە بەر دەرگای سوڵتان هەڵدەستێ و دادەنیشێ، وە ئەوەی دەرگایەكی داخراو بدۆزێتەوە لەتەنیشتی دەرگایەكی كراوە دەدۆزێتەوە، ئەگەر داوابكات پێی دەدرێ، وە ئەگەر داوای پەنادان بكات پەنا دەدرێ، وە بێگومان یەكەم دووڕوویی پیاو تانەدانیەتی لە پێشەواكەی) .

**٦٠** - حذيفه رضي الله عنه دەفەرمووێ : (دەرگاكانیان شوێنی فیتنەیە، دەچنە ناوی بەڕوویەكەوە، وە دەردەچن بە ڕوویەكی تر .

وە بیستم باوكی عبد الله دەیووت : بۆی گێڕاینەوە كوڕی مهدي، بۆی گێڕاینەوە سوفیان الثوري ، لە سلمەی كوڕی نُبیط، دەڵێت : ووتمان بە باوكم : ئایا ناچیت بۆ لایان **[واتە لای دەسەڵاتداران]**؟

ووتی : من دەترسم شتێكیان لێ ببینم بەهۆیەوە بكەومە ناو ئاگرەوە) .

**٦١** - ئەبو درداء رضي الله عنه دەڵێت : (ئیسلام نییە تەنها بە گوێڕایەڵی نەبێ، وە خێر نییە تەنها لە جەماعەت نەبێ، وە ئامۆژگاری و دڵسۆزیە بۆ الله تعالی و بۆ پێشەوا و بۆ ئیمانداران بە گشتی) .

**٦٢** - عبداللهی كوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ فەرمووی : (دەسەڵاتدارانێك فەرمانڕەوایەتیتان دەكەن گەندەڵی و خراپە دەكەن وە ئەوەی الله تعالی پێیان چاك دەكات زیاترە، جا هەریەكێك لەوان كاربكات بە گوێڕایەڵی الله تعالی، ئەوا پاداشتی بۆ هەیە، وە لەسەر ئێوەش شوكرانەكردنی الله تعالی یە، وە ئەوەی كاربكات لەوان بە

سەرپێچیکردنی اللە تعالی، ئەوا تاوانەکەی لەسەر خۆیانە و لەسەر ئێوەش ئارامگرتنە) .

---

محمد ی کوڕی حسین رحمه الله له (الشريعه - ١/ ٣٧٠) دەڵێت :

(باسمکردووە له تەحزیر و ئاگادارکردنەوە له مەزهەبی خەواریج کە ڕوونکردنەوەی تێدایە بو کەسێك کە اللە تعالی پاراستوویەتی له مەزهەبی خەواریج، وە لەسەر بیر و بۆچوونی ئەوان نییە، وە ئارامدەگرێ لەسەر زوڵم و زۆرداری پێشەوا و دەسەڵاتداران، وە دەرناچێت لێیان بە شمشێرەکەی، وە داوا له اللە تعالی دەکات ئەوزوڵم و ستەمە لەسەر خۆی و مسوڵمانان لاببات، وە دوعا بۆ دەسەڵاتداران دەکات بە چاکبوون، وە حەجیان لەگەڵ دەکات، وە جیهادیان لەگەڵ دەکات جیهادی هەموو دووژمنێکی مسوڵمانان وە نوێژی جومعە و دوو جەژنەکە دەکات لەگەڵیان، جا ئەگەر فەرمانیان پێکرد بە چاکە ئەگەر له توانایدا هەبوو گوێڕایەڵیان دەکات، وە ئەگەر لەتوانایدا نەبوو داوای لێبوردنیان لێدەکات و عوزریان بۆ دەهێنێتەوە، وە ئەگەر فەرمانیان پێکرد بە سەرپێچی کردنی اللە تعالی ئەوا گوێڕایەڵیان ناکات، وە ئەگەرفیتنە له نێوانیان هەڵگیرسا ئەوا پەیوەست دەبێت بە ماڵەکەیەوە، وە دەست وزمانی دەگرێ، وە حەزو ئارەزووی ناچێ بۆ ئەوەی ئەوان تێیدانە [لە شەڕو ئاژاوە]، وە یارمەتییان نادات لەسەر فیتنە، جا ئەوەی ئەوە سیفەتی بێت ئەوا لەسەررێگە ڕاستەکەیە إن شاء الله .

**٦٣** - عمری کوڕی زید دەڵێت : (بیستم حەسەنی بصري له ڕۆژانی یزیدی کوڕی مهلب ووتی : وە کۆمەڵە کەسێك هاتن بۆ لای جا فەرمانی پێکردن

كە لە ماڵەكانیان بمێننەوە، وە دەرگاكانیان لەسەرخۆیان دابخەن، پاشان ووتی : واللە ئەگەر خەڵكی كاتێك تاقیكرانەوە بە دەسەڵاتدارەكانیان ئارامبگرن ئەوا زۆر ناخایەنێت بۆ ئەوەی اللە تعالى ئەو تاقیكردنەوەیان لەسەر هەڵبگرێ، بەڵام ئەوان ڕادەكەن و پەنا دەبەنە بەر شمشێر جا دەدرێنە دەستی، سوێند بە اللە تعالى هەرگیز ڕۆژێك بەخێرەوەش نەهاتوونە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿**وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلۡحُسۡنَىٰ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُواْۖ وَدَمَّرۡنَا مَا كَانَ يَصۡنَعُ فِرۡعَوۡنُ وَقَوۡمُهُۥ وَمَا كَانُواْ يَعۡرِشُونَ**﴾ [**الأعراف** : ١٣٧] .

## ٨ - له فیتنه‌كان : چوونه لای ده‌سه‌ڵاتدار و دانیشتن له‌گه‌ڵیان

٦٤ - أبو بكر المروذي رحمه الله ده‌ڵێت : (بیستم باوكی عبدالله [ئیمام ئه‌حمد] ووتی : نزیك بوونه‌وه لێیان فیتنه‌یه، وه دانیشتن له‌گه‌ڵیان فیتنه‌یه، ئێمه دوورین لێیان وا نابینم سه‌لامه‌تبین، چجای ئه‌گه‌ر نزیك بینه‌وه لێیان ؟! ).

٦٥ - حذیفه‌وه رضي الله عنه فه‌رمووی : (ده‌رگاكانیان شوێنی فیتنه‌یه، ده‌چنه به‌هه‌شته‌وه به ڕوویه‌كه‌وه، وه لێی ده‌رده‌چن به ڕوویه‌كی تر) .

٦٦ - سلمة ی كوڕی نُبیط ده‌ڵێت : ووتمان به باوكم : ئایا ناچیت بۆ لایان [ده‌سه‌ڵاتداران] ؟

ووتی : من ده‌ترسم شتێكیان لێ ببینم به‌هۆیه‌وه بكه‌ومه ناو ئاگره‌وه .

٦٧ - گوێم له اسحاق بن حنبل بوو، كه ئێمه‌ش له معسكر بووین [شوێنێكه سه‌ربازی لێ كۆكراوه‌ته‌وه، له سامه‌ڕا بووه] بانگی باوكی عبد الله كرد،

پرسیاری لێکرد لەوەی بچێتە لای خەلیفە تاکو لەکاروبارەکان فەرمانی پێبکات یان ڕێگری لێبکات، پێی وت : لەتۆ قبوڵی دەکات، ئەوە إسحاق بن راهویە چۆتە لای ابن طاهر فەرمانی پێکردووە و ڕێگری لێکردووە، أبو عبد الله پێی وت : بە إسحاق بەڵگەم بەسەردا دەهێنیتەوە؟ من ڕازی نیم بەکردەوەکەی، بینینی من بۆ ئەو خێری تیا نیە **[واتە خەلیفە بینینی خێری تیانیە بۆی]**، وە بینینی ئەو بۆمن خێری تیانیە) .

**٦٨** - وە بیستم باوکی عبداللە فەرمووی : (واجب بێت لەسەرم ئەگەر بینیم - واتا خەلیفە - فەرمانی پێ بکەم بەچاکە و ڕێگری لێبکەم لە خراپە).

**٦٩** - وە بیستم إسماعیل ی کوڕی خوشکی عبداللەی کوڕی مبارك منازەرەی باوکی عبداللەی دەکرد و قسەی لەگەڵ دەکرد لەبارەی چوونە لای خەلیفە، جا ئیمامی ئەحمەد پێی ووت : بێگومان خاڵت ووتی - واتا کوڕی مبارەك : مەچوونە لایان، ئەگەر چوون بۆلایان ئەوا بەڕاستیان بخەرەوە، وە من دەترسم کەوا بەڕاستیان نەخەیتەوە) .

**٧٠** - وه بیستم عبدالصمدی کوڕی یەزید ووتی : (فەرمانمان پێکراوه کەوا نەچینە لایان، بەڵام ئەگەر چووینە لایان حەق بڵێین) .

**٧١** - وه بیستم هارونی کوڕی مەعروف ووتی : (بۆی گێڕاینەوە علقمة، لە أبي هاشمەوە، ووتی : ابن محیریز ووتی : ئەوەی دانیشت لەسەر سەرینەکان ئامۆژگاری لەسەر واجب دەبێت) .

**٧٢** - وه بیستم عبدالصمدی کوڕی یەزید ووتی : فضیل ووتی : (فەرمانکار و ڕێگریکار نییە ئەو کەسەی دەچێتە لایان و فرمانیان پێدەکات و ڕێگریان لێدەکات، پاشان بانگی دەکەن بۆ خواردن و خواردنەوەکانیان و وەڵامیان دەداتەوە، فەرمانکار و ڕێگریکار ئەو کەسەیە دووردەکەوێتەوە لێیان، وه ناچێتە لایان، ئا ئەوە فەرمانکار و ڕێگریکارە) .

**٧٣** - وه فضیل ووتی : (چەند زانا هەیە دەچێتە لای دەسەڵاتدار و دینەکەی لەگەڵە، وه دەردەچێت و هیچ شتێك لە دینەکەی لەگەڵ نییە، الله تعالى تووشی موسیبەتمان نەکات لە دینەکەمان) .

**٧٤** - وە فضيل ووتی : (لەوانەیە زانا بچێتە لای دەسەڵاتدار و شتێك لە دینەكەی لەگەڵ بێت، وە دەر بچێت و هیچ شتێك لە دینەكەی لەگەڵ نەبێت .

جا ووتمان : وە چۆن دەبێت ئەوە؟!

فضيل ووتی : بەڕاستی دەخاتەوە لە درۆكانی، وە مەدحی دەكات بەڕەو ڕووی) .

**٧٥** - عبدالرحمن ی كوڕی نوفل ووتی : (ووترا بە علقمة : چی دەبێت ئەگەر بچیتە لایان جا پێگەو قیمەتت بزانن و شەفاعەت بكەیت؟

ووتی : بەڕاستی من دەترسم لە قەدری خۆم كەم بكەمەوە زیاتر لەوەی لە قەدری ئەوان كەم بكەمەوە) .

**٧٦** - وە بیستم عباس العنبري دەیووت : (بۆی گێڕاینەوە مؤملی كوڕی ئیسماعیل، بۆی گێڕاینەوە سفیان، لە منصورەوە، لە ئیبراهیمەوە، كەوا معاویە نووسی بۆ فلان كەس - ناوەكەم بیرچۆتەوە - : كەوا چەند كەسێك بە وەفد بنێرێ بۆلای لە خەڵكی كوفە، جا كەسەكە ناوی عەلقەمەی لە

ناو وەفدەكە نووسى، جا عەلقەمەش نێردراوێكى نارد بۆلاى : ناوى من ڕەشبكەوە، ناوى من ڕەشبكەوە) .

**٧٧** - الضحاكى كوڕى عثمان، ووتى : عمرەى كچى عبدالرحمن بە كوڕەكەى أبي الرجالى ووت : كوڕەكەم، ئاگاداربە ئاگاداربە لە دانیشتنیان، چونكە بێگومان تۆ لە نێوان دوو شت دایت : یان دەستت گرتۆتەوە لە حەق **[فەرمانى پێ ناكەیت بە چاكە]**، وە یان یارمەتیت داوە لەسەر زوڵم و ستەم .

**٧٨** - خوێندمەوە بەسەر باوكى عبدالله **[ئیمام ئەحمەد]** : حسینى كوڕى محمد، ووتى : بۆى گێڕاینەوە حمادى كوڕى الأبح، لە محمدى كوڕى واسعەوە، كە وا بە پیاوێكى ووت : داواى شەفاعەتى لێ بكە **[لە ئەمیر]**، هاوار بۆ تۆ بەڕاستى نزیك بوونەوە لێیان سەربڕینە .

**٧٩** - بیستم ئەحمەدى كوڕى عیسى المروزي دەیووت : بیستم فضالەى كوڕى سفیان، ووتى : (السكن ویستى حەج بكات ، جا بە عبداللهى كوڕى مبارەكى ووت : حەز دەكەم بۆم بنووسى بۆ لاى فلان كەس .

عبد الله ووتی : بۆت دەنووسم بۆ لای سوفیان الثوري، جا کاتێك دەرچوو عبداللهی بۆی نووسی بۆلای سوفیان، جا گەیشتە لای سوفیان و سوودی لێ بینی .

جا کاتێك کاتی ڕۆیشتنی هات ویستی ماڵئاوایی لە سوفیان بکات، سوفیان پێی ووت : سەلامم بگەیەنە بە باوکی عبد الرحمن، وە پێی بڵێ : ئامۆژگاریەکەم بپارێزە، جا کاتێك السکن گەڕایەوە بۆلای پەیامەکەی پێ گەیاند، کاتێك سفیان مرد .

عبد الله بە السکنی ووت : ئایا دەزانی ئامۆژگاریەکەی چی بوو؟ السکن ووتی : نەخێر .

ووتی : جا عبد الله ووتی : بەو شێوە، یان بە پەنجەکانی گەیاندی، واتە : نزیك مەبەرەوە لێیان [دەسەڵاتداران] ) .

٨٠ - وە بیستم داودی کوڕی رشید دەیووت : عبد اللهی کوڕی المبارك ووتی : لە جاروش [ئەوەی کە گەنمی پێ ورد دەکرێ] برنج، و نانی گەنمی لێ وەرگرە وە ئەوانە حەڵاڵ بکەو، لەگەرمەی ئاگری سەخت ڕزگارت دەبێت وە من ناتوانم الله ڕێنیشاندەرت بێ لە ماڵی دەسەڵاتدار [مەبەستی ئەوەیە کە نەچیتە بەر دەرگای دەسەڵاتداران]، سەردانی مەکە و لێی دوورکەوە، ئەوە بەڕاستی خراپەیەکی ساختەیە [واتە بەڕووی ڕاستەقینە لەگەڵت نابن، بەڕووە ساختەکەیان

مامەڵە دەکەن، جا ئەمەش لەخۆیدا خراپەیەکی گەورەیە] ، گومان لە دین درووست دەکات و خراپت دەکات، بە خۆشەویستی گەورە . [چونکە بەردەم ماڵی دەسەڵاتداردەکرێ شتی خەیاڵیت پێ بدەن] ) .

٨١ - وە بیستم ئەحمەدی کوڕی خەلیل دەیووت : بۆی گێڕامەوە الحسن ووتی : ووتم بە عبد اللّٰەی کوڕی المبارك : (بەڕاستی پێم گەیشتووە کە حمادی کوڕی زید ووتی بە سوفیانی ثەوری کاتێك ڕایکرد لەدەست ئەبو جەعفەر بۆ بەصرە : ئەگەر بچوویتایە بۆلای ئەوانە، جا فەرمانت پێ بکردنایە بە چاکە و ڕێگریت لێکردبانایە لە خراپە، ئایا پاداشتت گەورەتر نەدەبوو؟

سوفیان ووتی : بێگومان ئەوان تووڕەبوونی منیان دەویست جا پێم ناخۆش بوو کەوا خۆم زەلیل بکەم بۆیان .

جا عبد اللّٰەی کوڕی مبارك ووتی : کێ ئەو هەواڵەی پێدایت؟

ووتم : هەندێك هاوەڵانمان لە نەیسابوور .

جا ووتی : هیچ شتێکی نەووت .

ووتم : جا چی ڕێگری لێی کرد؟

ووتی : بێگومان سوفیان دەیووت : بەڕاستی ئەوانە پێیان دراوە لە دونیا ئەوەی دەیبینیت، جا کاتێك چوویتە لایان و چاکەیەکت بینی لەولاوە، وە

نەرم و نیانیەك لەولاوە، وە ڕێزگرتنەك لەولاوە، وە قەنەفە و سەرینێك لەولاوە، جا چی دڵێك بەرگەی ئەوە دەگرێت و مەیلی ناچێت بۆیان؟ ) .

**٨٢** - وە بیستم أبا علي عبد الجبار الهروي دەیووت : بۆی گێڕاینەوە عبد الصمد ی کوڕی الحسان ووتی : (کاتێك گەیشت بە سوفیان الثوري کەوا ابن أبي ذئب هەزار دیناری وەرگرتووە لە المهدي ئەو کەسەی کەوا فەرمانی پێ کردبوو، سوفیان ووتی : هەزار دیناری لێوەرگرتووە، دڵی لەکوێ بوو لەوکاتەدا؟

ووتی : فەرمانی پێکرابوو بە وەرگرتنی دینارەکان، جا ووترا پێی : وەریبگرە، جا لەوانەیە المهدي داوات نەکات و وازت لێبهێنێ ئەگەر وەریبگری، چونکە بەڕاستی ئێمە دەبینین حاڵ و گوزەرانت خراپە، وە حاڵی ئەوەی پێویستی بە تۆیە .

ووتی : جا سوفیان ووتی : بەڕاستی من لە دینارەکانیان دەترسێم وەك لەهەموو شتێکیان) .

**٨٣** - سعیدی کوڕی عبدالغفار، لە عبداللهی کوڕی المبارك ەوە، ووتی : بیستم علي کوڕی فضیل کوڕی عیاض دەیووت : (پیاوێ لە زانایان چووە

لای پیاوێ له دەسەڵاتداران، جا فەرمانی پێكردوو و ڕێگری لێكرد، جا ئەمیرەكەش فەرمانی كرد كەوا بكرێتە لە شوێنێكدا سجن بكرێ، وە ڕێزی گرت و دڵ فراوان بوو لەگەڵی، وە ڕێگەی نەدەدا بە هیچ كەسێك كە بچێتە لای جگە لەوكەسە نەبێ كە مەدح و ستایشی ئەمیر دەكات .

ووتی : جا ڕۆژێك پیاوێك چووە لای و قسەی بە ئەمیر گووت و لێی كەم كردەوە ، لەوكاتەدا زانا زیندانیكراوەكە ڕەددی ووتەكانی دەدایەوە و مەدح و ستایشی ئەمیری دەكرد، پاشان هێنرا بۆلای ئەمیر، هەواڵدرا بە ئەمیر لەو بارەدا، ووترا : بەڕاستی فلان زانا كە زیندانیت كردبوو مەدح و ستایشت دەكات و بەرگریت لێدەكات .

جا ئەمیر بانگی كرد، كاتێك زاناكە چووە لای ئەمیرەكە پێی ووت : ئەوە تۆیت، هاتم بۆ لات بەكەمێك ڕێز گرتن و بەخشینەوە وازت لە دینەكەت هێنا، جا چۆن فەرمانم پێدەكەیت كە وازبهێنم لەو خۆشی و نیعمەتەی كە تێیدام بە قسەكانت؟!

علي كوڕی فضیل ووتی : وای دەبینم ئەمیرەكە لە خواترسانی زیاتر بێت لە زانایەكە) .

**٨٤ -** بۆم گێڕدراوەتەوە لە أبي صالح الفراء، ووتی : بۆی گێڕاینەوە یوسفی كوڕی أسباط، ووتی : (هەركات سوفیانی ثوري ڕەخنەی لێبگیرابا **[لەبارەی**

**هەڵاتن و ڕاکردنی لە سوڵتان]** دەیووت : پاشایەك هەبوو لە نەوەی ئیسرائیل، وە کەسێکی خواپەرستیشیان تێدابوو، کە خزمەتی دەکرد لەلای دەرگاکەی، جا پاشا ناردی بەدوایدا و گرتی و بردیە ناو ماڵێکەوە، سێ ڕۆژ دەرگاکەی لەسەر داخست، لە ڕۆژی سێیەمدا کاتێ پاشا سفرە و خوانی لە پێش دانرا، پاشا ووتی : ئەو خوانە ببەن بۆ ئەو پیاوە، ووتی : جا دەرگایان کردەوە و سفرە و خوانەکەیان لەپێش دانا، پاشا ووتی : هەواڵم بدەنێ چی کرد .

ووتی : خوانەکەی ڕەتکردەوە، ووتی : جا هەواڵی پێدرا، پاشا ووتی : دەرگای لەسەر داخەن بۆ سێ ڕۆژی تر، پاشان سفرە بۆ پاشا دانرا، پاشا ووتی : بیبەن بۆ لای ئەو پیاوە، جا لە پێشی دانرا، جا لێی خوارد هەتا تێر بوو، ووتی : دواتر پاشا لە جوانترین کەنیزەکی خۆی نارد بۆی تا خزمەتی بکات، عابدەکە خۆی بۆ ڕانەگیرا و زینای لەگەڵ کرد .

ووتی : جا هەواڵدرا بە پاشا، پاشاش بانگی کرد و پێی ووت : بەڕاستی تۆ سەروەت و سامانت لە من حەڕام کردبوو، وە وا گومان دەبەیت کەوا ئەوەی لەدەستمە ڕیبایە، جا داواکارم لێت کەوا هەڵبستیت و لە ناو خەڵکی داوای لێبوردنم لێبکەیت، جا هەستاو لەناو خەڵکی داوای لێبوردنی لێکرد، وە بەردەوام داوای لێبوردنی لێدەکرد و عوزری بۆ دەهێنایەوە، جا پاشا پێی ووت : من پاشام لەناو نەوەی ئیسرائیل، حوکم دەکەم بەپێی هەستەکانیان و

داوێنەكانیان، جا من لە موڵك و دەسەڵاتم دادپەروەرتربووم لە تۆ، باشترین خوانی خۆم بۆت نارد و لێت خوارد، وە جوانترین كەنیزەكی خۆم نارد بۆلات بەرگەت نەگرت و زینات لەگەڵ كرد، بۆیە من لە موڵك و دەسەڵاتی خۆم دادپەروەرتربووم لە تۆ، ووتی : پاشان پاشا لەگەردنی عابدەكەی دا) .

**٨٥** - ابن طاوس لە باوكیەوە وتی : (پیاوێك هاتە لای ابن عباس وتی : ئایە كەسێ هەڵناسێ بەرەو ڕووی دەسەڵاتدار تا فەرمان و نەهی لێبكات؟

ابن عباس وتی : فیتنە مەنێیەوە .

وتی : ئەی گەر فەرمانی پێكردم بە سەرپێچی كردنی الله تعالى، ڕەئیت چۆنە؟

[ابن عباس] وتی : ئەوە ئەوەیە كە دەتەوێت، ئەوكات پیاو بە) .

**٨٦** - عبد الله ى كوڕی مبارك ووتی : (عائذی كوڕی عمرو لەگەڵ أبى مسلم دانیشت لەسەر یەك سفرە، جا عائذ ئامۆژگاری أبا مسلمى كرد، ووتی : جا ابن المبارك ڕایگەیاند و ووتی : هەڵاتنی سوفیان خۆشەویسترە لەلامان لە ووتەی ئیبراهیمی الصایغ) .

**٨٧** - بشري كوڕی حارث دەیووت : (بێگومان سوفیان کارێکی کردووە تێیدا بووە بە پێشەنگ، هەڵاتنی لە سوڵتان) .

**٨٨** - محمد ووتی : (ئەگەر ئەمیر بانگی کردی بۆ ئەوەی قورئانی بەسەردا بخوێنیتەوە ئەوا مەچۆ بۆ لای) .

**٨٩** - محمدی کوڕی سیرین دەیووت : (ئەگەر والی بانگی کردی بۆ ئەوەی سورەتێکی قورئانی بەسەردا بخوێنیتەوە ئەوا مەچۆ بۆ لای) .

**٩٠** - یونس ی کوڕی عبید دەیووت : (پێم خۆش نییە لەگەڵ سێ جۆرە کەس دابنیشم : پێم خۆش نییە لەگەڵ پێشەوایەك دابنیشم، ئەگەر چی بشڵێت : سورەتێکی قورئانم بەسەردا بخوێنەوە، وە پێم خۆش نییە لەگەڵ ئافرەتێك دابنیشم کە مەحرەمم نییە، وە لەگەڵ کەسێکی بیدعەچی) .

**٩١** - بیستم باوکی عبد الله دەیووت : سوفیانی کوڕی وکیع بۆی نووسیم، بیستم باوکم دەیووت : سوفیانی ثوري پێی ووتین : ئێمە ئەوڕۆ

لەسەر ڕێگاکەین، ئەگەر ئێمەتان بینی کە لاماندا‌وە بۆ لای ڕاست و چەپ ئەوا شوێنمان مەکەون .

ووترا بە باوکی عبد الله لەبارەی ئەو ووتەیەی ئیمامی الثوري : ئەگەر ئێمەتان بینی کە لاماندا‌وە بۆ لای ڕاست و چەپ ئەوا شوێنمان مەکەون، ئەو ڕستەیە مانای چییە؟ ووتی : مەبەستی کاروباری سوڵتانە) .

**٩٢** - وە بیستم باوکی عبد الله دەیووت : (وە باسی هاوەڵانی عبد الله ی کوڕی مسعود کرا رضي الله عنه، جا ووتی : خوا پەرست بوون نەدەچوونە لای دەسەڵاتدار، وە باسی طاووس کرا جا ووتی : زۆر توند بوو لەسەریان، کوڕەکەی بەناوی ئەوەوە کتابێکی نووسی بۆ لای عومەری کوڕی عبد العزیز، جا ئیمامی عمریش سێ سەد دیناری پێدا، ئەو هەواڵە گەیشتەوە بە ئیمام طاووس، ئەویش کەل و پەلەکانی فرۆشت، ناردیەوە بۆ عمر، جا داوایان دەکرد کە ئیمامی طاووس ڕێگەبدات کوڕەکەی بێتە لای ئەویش نکۆڵی دەکرد، یان ووتی : بۆی نییە بێتە ژوورەوە تەنها لەکاتی مردنم نەبێت) .

**٩٣** - محمدی کوڕی جابر، ووتی : (ووترا بە عبد اللهی کوڕی المبارك : ئەی باوکی عبد الرحمن، سوفیان فەرمانی پێ نەکردن بە چاکە **[واتە**

دەسەڵاتداران]، ئەویش ووتی : الله أكبر، چی كارێك قورسترە لە ڕاكردن لێیان) .

**٩٤** - سوفیان دەیووت : ٠من پیاوێك دەناسم ئەگەر لە ئاسمانەوە بگەڕێتەوە بۆ زەوی [واتە خۆی سەراو ژێر بكرێت والله اعلم]، وە هەڵبواسرێ بە ئەژنۆكانی، یان ووتی : بە پێیەكانی، ئەوا ناڕواتە لای دەسەڵاتدار، ووتی : ئێمە وامان دەبینی مەبەستی نەفسی خۆیەتی) .

**٩٥** - یوسفی كوڕی أسباط، دەیووت : (سوفیان پێی ووتم : ئەگەر قورئان خوێنەكەت بینی هانای دەبرد بۆ دەسەڵاتدار ئەوا بزانە ئەوە چەتە و ڕێگرە، وە كاتێك بینیت هانای دەبرد بۆ دەوڵەمەندەكان ئەوا بزانە ئەوە ڕیابازە) .

**٩٦** - بیستم سوفیانی الثوري دەیووت : (چاوم بەو پیاوە كەوت كە ڕقم لێیەتی، جا پێم دەڵێت : چۆن بەیانیت كردەوە؟ دڵم بۆی نەرم دەبێت، چجای بۆ ئەو كەسەی ثریدی ئەوانی خواردووە و لەسەر فەرشەكانیان دانیشتووە

**[ثريد : و اته تێگوشه، خواردنێكه پێكهاتووه له نانی وردكراولەگەڵ گۆشت وشۆربا یان هەرشلەیەكی تر] ) .**

**٩٧** - عبد الله ووتی : (بەڕاستی پیاو لە ماڵەكەی دەردەچێت و دینەكەی لەگەڵە، جا دەگات بە پیاوێك كە پێویستیەكی پێی هەیە پێی دەڵێت : بێگومان تۆ ئاوا و ئاوایت، پێیدا هەڵدەدات و مەدحی دەكات، وە لەوانەیە هیچ لە پێداویستییەكانی بۆ جێبەجێ نەكات، جا دەگەڕێتەوە و الله عزَّوَجَل لێی تووڕەیە و هیچ شتێكیشی لە دینەكەی لەگەڵ نەماوە) .

**٩٨** - أبو اسحاق دەیووت : (بیستم سلیمان الخواص دەیووت : ئەگەر چوومە لای هەندێك لەو دەسەڵاتدارانە پێم خۆش نییە دابنیشم لەسەر فەرش و قەنەفەكانیان، لە ترسی ئەوەی دڵم نەرم ببێت بە دانیشتن لەسەر فەرش و قەنەفەكانیان) .

# ٩ - له فيتنه‌كان : فيتنه‌ى ئافره‌ت

**٩٩** - قال رسول الله ﷺ : (ما تركت في الناس بعدي فتنه أضر على الرجالِ من النساء) .

واته رسول الله ﷺ فه‌رموويه‌تى : (هيچ فيتنه‌يه‌كم له‌نێو خه‌ڵكيدا به‌جێنه‌هێشتووه وه‌ك ئافره‌ت كه زيانى زياترى هه‌بێت بۆ سه‌ر پياوان) .

# ١٠ - لە فیتنەکان : فیتنەی منداڵ

**١٠٠** - إبن بریدە رضي الله عنه، لە باوکیەوە، وتی : رسول الله ﷺ ووتاری جومعەی دەدا لەو کاتەدا ئیمامی حسن و حسین هاتنە ژوورەوە، دوو کراسی سووریان لەبەر بوو، دەڕۆیشتن و بەردەبوونەوە، پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەر دابەزی و هەردووکیانی هەڵگرت و لە پێشە خۆی داینان، جا ووتی : (الله عزَّوَجَل ڕاستی فەرموو ﴿**إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ**﴾، **[التغابن : ١٥]**، سەیری ئەو دوو منداڵەم کرد دەڕۆیشتن و بەردەبوونەوە، نەمتوانی ئارامبگرم چیتر بۆیە ووتارەکەم پچڕاند و ئەوانم هەڵگرتەوە) .

**١٠١** - إبن بریدة، لە باوکیەوە، ووتی : رسول الله ﷺ ووتاری جومعەی دەدا لەو کاتەدا ئیمامی حسن و حسین هاتنە ژوورەوە، دوو کراسی سووریان لەبەر بوو، بەردەبوونەوە و هەڵدەستانەوە، کاتێ پێغەمبەر ﷺ ئەوانی بینی لەسەر مینبەر دابەزی و هەردووکیانی هەڵگرت، پاشان چووەوە سەر مینبەر و لەپێشە خۆی داینان، جا ووتی : (الله عزَّوَجَل ڕاستی فەرموو ﴿**إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ**

وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ﴾ [التغابن : ١٥] ئەو دووەم بینی بەردەبوونەوە، نەمتوانی ئارامبگرم بۆیە ووتارەکەم پچڕاند و ئەوانم هەڵگرتەوە) .

# ١١ - له فیتنه‌كان : تاقیكردنه‌وه‌كانی مسوڵمانان به‌ گاور و جوله‌كه

**١٠٢** - له‌ أبو هريرة رضي الله عنه، له‌ رسول الله‌وه‌ ﷺ فه‌رمووی : (به‌ دڵنیاییه‌وه‌ ئێوه‌ شوێن قه‌ومانی پێش خۆتان ده‌كه‌ون بست به‌ بست و گه‌ز به‌ گه‌ز و باڵ به‌ باڵ، هه‌تاوه‌كو بچنه‌ ناو كونی بزن مژه‌شه‌وه‌ دوایان ده‌كه‌ون)

.

**١٠٣** - له‌ أبو هريرة رضي الله عنه، له‌ رسول الله وه‌ ﷺ فه‌رمووی : (به‌ دڵنیاییه‌وه‌ ئێوه‌ شوێن قه‌ومانی پێش خۆتان ده‌كه‌ون بست به‌ بست و گه‌ز به‌ گه‌ز) .

ووترا : ئه‌ی رسول الله ﷺ مه‌به‌ستت فارس و ڕۆمه‌؟

فه‌رمووی : (ده‌بێت كێ بێت جگه‌ له‌وان؟)

**١٠٤** - حذەيفة ی كوڕی اليمان رضي الله عنه ووتی : (شوێن پێی ئەوانەی پێش خۆتان دەكەون، نەعل بە نەعل شوێنیان دەكەون، ڕێگاكەیان هەڵە ناكەن، وە ئێوەش بەهەڵەدا نابەن، وە گرێی ئیسلام هەڵدەوەشێتەوە گرێ بە گرێ، وە یەكەم گرێ كە هەڵدەوەشێتەوە خشوعە لە نوێژدا، هەتاوەكو كەسێك نادۆزیتەوە خاشع بێت لە نوێژەكەیدا) .

# ١٢ - ئەو فیتنانەی کە لە سەردەمی هاوەڵاندا ڕوویداوە رضي الله عنهم

**١٠٥** - لە حەسەنەوە رحمە اللە، ووتی : (عمر ی کوڕی خطاب رضي الله عنه دەستی ئەبو ذڕی رضي الله عنه گرتبوو بە توندی گوشی، ئەبو ذریش پێی ووت : چیتە ئەی قوفڵی ئیسلام ئەزیەتت دام .

ئیمامی عومەریش پێی ووت : ئەوە مانای چییە [قوفڵی ئیسلام] ئەی ئەبو ذر؟

ئەبو ذر ووتی : ئەی پێشەوای ئیمانداران، ئەو ڕۆژەت لەبیرە ؟

کاتێك هاتیت و دەرکەوتی لە دۆڵەکە، رسول اللە ﷺ فەرمووی : (فیتنە بەرۆکتان ناگرێ مادەم ئەوە لە ناوتاندا بێت) .

جا تۆ قوفڵی ئیسلامی ئەی عمر رضي الله عنه) .

**١٠٦** - لە حذیفەوە رضي الله عنه، ووتی : ئیمامی عمر ی کوڕی الخطاب رضي الله عنه فەرمووی : کێ فەرموودەمان بۆ دەگێڕێتەوە لەبارەی فیتنە؟

جا ووتم : من، وە بیستم پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (فیتنەی پیاو کە تووشی دەبێت بەهۆی ماڵ و منداڵی، ڕەشی دەکاتەوە نوێژ و ڕۆژوو و خێرکردن) .

ئیمامی عمر رضي الله عنه ووتی : مەبەستم ئەو فیتنەیە نەبوو، پرسیارت لێدەکەم لەو فیتنانەی کە شەپۆڵ دەدات وەکو شەپۆڵی دەریا؟

جا ووتم : بەڕاستی لەنێوانی تۆ و فیتنەدا دەرگایەکی داخراو هەیە، کوژرانی پیاوێك یان مردنی .

ئیمامی عمر ووتی : ئایا ئەو دەرگایە دەشکێت یان دەبێتەوە؟

ووتم : نەخێر بەڵکو دەشکێت، جا ئیمامی عمر ووتی : ئەوە لەبارترە کە دانەخرێ هەتاوەکو ڕۆژی قیامەت .

الأعمش زیادی کرد : ترساین کە پرسیار لە حذیفە رضي الله عنه بکەین [لەبەر ڕێز و هەیبەتی] : ئایا ئیمامی عمر دەیزانی کە ئەو دەرگایە بە خۆیتی؟ جا داوامان لە مسروق کرد ئەو پرسیاری لێکرد .

حذیفە ووتی : بەڵێ وەکو چۆن دەزانرێ کەوا شەو دادێت پێشی سبەی بەیانی .

وە من فەرموودەیەکم گێڕاوەتەوە کە هیچ هەڵەیەکی تێدا نییە) .

**١٠٧** - لە ئەبو الأشعث الصنعانی، کەوا کۆمەڵە وتاربێژێك هەستان بۆ ووتاردان لە شام کە هەندێکیان هاوەڵی رسول اللە ﷺ بوون تا کۆتا کەسیان هەستا پێی دەووترا : مرە کوڕی کعب، جا ووتی : ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە فەرموودەیەکم بیستووە لە رسول اللە ﷺ ئەوا هەڵنەدەستام، جا باسی فیتنەی کرد و نزیکی کردەوە، لەو کاتەدا پیاوێك بەوێدا تێپەڕی، رسول اللە ﷺ فەرمووی : (ئەوە ئەو ڕۆژە لەسەر ڕێگا ڕاستەکەیە) .

جا هەستام بۆ لای و ڕووم کردە کەسەکە، جا ووتی : ئەوە خۆیەتی؟

ووتی : بەڵێ .

جا ئەو کەسە عوسمانی کوڕی عفان رضي اللە عنە بوو) .

**١٠٨** - لە ئەبو قلابەوە، لە پیاوێکەوە، ئیسحاق ووتی : حماد ووتی : ئەوە ئەبو الأشعث الصنعانیية، ووتی : (ئامادەی ووتارەکان بووم لەکاتی سەرهەڵدانی یەکەم فیتنە لە شام، ووتی : جا لە کۆتاییدا پیاوێك هەستا، پێی دەووترا : مرە کوڕی کعب رضي اللە عنە، جا ووتی : ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە فەرموودەیەکم بیستووە لە رسول اللە ﷺ ئەوا هەڵنەدەستام، بێگومان ڕۆژێکیان رسول اللە ﷺ باسی فیتنەی کرد، جا پیاوێکی ڕووخسار داپۆشراو تێپەڕی، جا رسول اللە ﷺ فەرمووی : (ئەوە و هاوەڵانی لەسەر حەقن) .

جا بەدوای کەوتم بینیم ئەو کەسە عثمان ی کوڕی عفان رضي الله عنه بوو .

**١٠٩** - لە عبداللهی کوڕی عومەرەوە رضي الله عنهما، ووتی : (رسول الله ﷺ باسی فیتنەی کرد، جا پیاوێك تێپەڕی، جا رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەو ڕووخسار داپۆشراوە تێیدا دەکوژرێ بە زوڵملێکراوی) .

عبد الله ووتی : جا سەیرم کرد، ئەو کەسە عثمان ی کوڕی عفان رضي الله عنه بوو) .

ئیمامی الآجري رحمه الله دەڵێت : (هۆکاری کوژرانی عثمان ی کوڕی عفان ئەو هۆکارە چی بوو کە بووە هۆی کوژرانی) .

محمدی کوڕی حسین دەڵێت :

**١١٠** - ئەگەر کەسێك ووتی : (باست کرد لە پێغەمبەرەوە ﷺ کەوا باسی چەند فیتنەیەکی کردووە کە لە دوای خۆی ڕوودەدات، پاشان لەبارەی ئیمامی عثمان رضي الله عنه فەرمووی : شوێنی ئەوە و هاوەڵانی بکەون چونکە ئەو ڕۆژە ئەوان لەسەر ڕێگە ڕاستەکەن .

جا هەواڵمان پێبدە کەوا کێن هاوەڵەکانی؟)

پێی دەووترێ : هاوەڵانی هاوەڵانی رسول الله ن ﷺ شایەتی دراوەكان بە بەهەشت، ئەوانەی سیفەتەكانیان باسكراوە لە تەورات و ئینجیل، ئەوانەی ئەوەی خۆشیانی بوێت خۆشبەخت دەبێت، وە ئەوەی ڕقی لێیان ببێتەوە بەدبەخت دەبێت .

جا ئەگەر ووتی : باسیان بكە .

پێی دەووترێ : علي كوڕی أبو طالب و طلحة و زبير و سعد و سعيد وە تەواوی هاوەڵان لە كاتی خۆیاندا رضي الله عنهم، هەموویان لەسەر هیدایەت بوون هەروەكو چۆن پێغەمبەر ﷺ فەرمووی، وە هەموویان نكۆڵی كوژرانی عثمانیان كرد، وە هەموویان زۆر بە گەورەیان زانی ئەوەی كە بەسەری هات، وە شایەتیاندا بۆ بكوژانی ئیمامی عثمان كەوا لە ئاگرن .

جا ئەگەر كەسێك ووتی : جا پێمان بڵێ كێ كوشتی ؟

پێی دەووترێ : كۆمەڵێك الله بەدبەختی كردن بە كوشتنی ئیمامی عثمان بەهۆی حەسودی و زێدەڕەویان بۆی، وە دەیانویست فیتنە و دووبەرەكی و ڕق و كینە ڕوو بدات لە ناو ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ، لەوەی پێش كەوتبوو لەسەریان لە بەدبەختی لە دونیادا وە ئەوەی بۆیان ئامادەكراوە لە ئاخیرەت گەورەترە .

جا ئەگەر ووتی : باشە لە كوێ كۆبوونەوە لەسەر كوشتنی ئیمامی عثمان رضي الله عنه؟

پێی دەووترێ : (یەکەم جار و دەستپێکی کارەکە ئەوەبوو کە یەهودیەك کە پێی دەووترا : ابن السوداء، وە ناسراوبوو بە عبد اللهی کوڕی سبأ لەعنەتی اللهی لێبێت، وا خۆی نیشاندا کەوا مسوڵمان بووە، بۆیە لە مەدینە نیشتەجێ بوو، جا حەسودی هەڵگرت لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی و ئیسلام، جا خۆی خزاندە ناو مسوڵمانان وەکو چۆن پاشا یەهودیەکە بولس ی کوڕی شاوذ خۆی خزاندە ناو نەصارا هەتاوەکو گومڕای کردن، وە جیاوازی خستە ناویان و بوونە چەند تاقم و گرووپێك، جا کاتێك فیتنە و کوفری تێدا جێگیر کردن وازی لێیان هێنا، وە چیرۆکەکەی دوورو درێژە، پاشان گەڕایەوە سەر یەهودییەت دوای ئەوە، بەو شێوەیەش عبد اللهی کوڕی سبأ ئیسلامەتی دەرخست، وە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپەی دەرخست، وە هاوەڵانی بۆ پەیدابوو لە چەندان شوێن، پاشان بە ئاشکراکردنی دەدا لە ئەمیرەکان، وە پاشان تانەیدا لە عثمانی کوڕی عفان، پاشان تانەیدا لە ئەبو بکر و عمر رضي الله عنهما، پاشان وایدەرخست کەوا ئەو پشتیوانی ئیمامی علي رضي الله عنه دەکات، وە بێگومان الله علي کوڕی ئەبو طالب و کوڕەکانی و نەوەکانی پاراستووە لە مەزهەبی عبد اللهی کوڕی سبأ و هاوەڵەکانی، ڕۆیشت بۆ کوفە، هاوەڵی بۆ پەیدابوو لەوێ، پاشان هاتە بەصرە و لەوێش هاوەڵی بۆ پەیدابوو، پاشان ڕۆیشتە میصر، جا هاوەڵی بۆ پەیدا بوو لەوێ کە هەموویان لەسەر گومڕایی بوون، پاشان کاتێکیان دیاریکرد، وە نووسراویان نووسی بۆ ئەوەی لە شوێنێك

كۆببنەوە، پاشان هەموویان دەڕۆن بۆ مەدینە، بۆ ئەوەی خەڵکی مەدینە تووشی فیتنە بکەن و کردیشیان، پاشان ڕۆیشتن بۆ مەدینە، جا ئیمامی عثمانیان کوشت، وە لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی مەدینە نەیانزانی هەتاوەکو پێیان ڕاگەیەندرا .

جا ئەگەر ووتی : باشە بۆچی هاوەڵانی رسول الله ﷺ بەرگریان لێی نەکرد؟

پێی دەووترێ :بەڕاستی ئیمامی عثمان و هاوەڵەکانی نەیانزانی هەتاوەکو لەناکاو هێرشیان کردە سەر مەدینە، وە هیچ سوپایەك لەناو شاری مەدینە نەبوو کە ئامادەکرابێ بۆ جەنگ، جا کاتێك لەناکاو هەواڵیان بۆ هات ئیجتیهادیان کرد بۆ سەرخستنی و بەرگری لێکردنی، بەڵام ئەوە لە تواناياندا نەبوو، وە خۆیان فیدای ئیمامی عثمان کرد بۆ ئەوەی سەری بخەن ئەگەر بە نەفسی خۆشیان بێت، بەڵام ئیمامی عثمان نکۆڵی لێکردن و ووتی : ئێوە ئازادن لە بەیعەتی من، وە پێویست ناکات بەرگریم لێبکەن، وە من هیوام وایە کە بگەڕێمەوە بۆ لای الله عزَّوَجَل بە سەلامەتی و زوڵم لێکراوی، وە بێگومان علي کوڕی أبو طالب و طلحةی کوڕی زوبیر و زۆرێك لە هاوەڵان رضي الله عنهم گفتوگۆیان لەگەڵ ئەو گرووپە یاخی بووە کرد زۆر بەتوندی، وە ووتەی توندیان بەرامبەر بەکارهێنان، جا کاتێك زانیان کەوا هاوەڵانی رسول الله ﷺ ئینکاریان لێکردن، هەر گروپێك لەو یاخی بووانە خۆشەویستی هاوەڵانیان دەرخست، گرووپێك لەوان چوونە لای ماڵی علي

كوڕی أبو طالب رضي الله عنه، وا گومانیان برد كەوا علي كوڕی أبو طالب پشتیوانیان لێدەكات، بێگومان الله عزَّوَجَل ئیمامی علي بەری كردبوو لێیان، جا ڕیگریان كرد لە دەرچوونی، وە گرووپێك لەوان چوونە لای ماڵی طلحة رضي الله عنه، وا گومانیان برد كەوا طلحة پشتیوانیان لێدەكات، بێگومان الله عزَّوَجَل ئیمامی طلحةی بەری كردبوو لێیان، وە گرووپێك لەوان چوونە لای زوبير رضي الله عنه، وا گومانیان برد كەوا زوبير پشتیوانیان لێدەكات، بێگومان الله عزَّوَجَل ئیمامی زوبیری بەری كردبوو لێیان، وە بەڕاستی ئەوان دەیانویست هاوەڵان مەژغوڵ بكەن لە بەرگریكردن لە ئیمامی عثمان، وە سەریان لە خەڵكی مەدینە شێواندبوو بۆ ئەو قەدەرەی كە الله تعالى تەقدیری كردبوو كەوا ئیمامی عثمان دەكوژرێ بە مەزڵومی، جا ڕووداوێك هات بەسەر هاوەڵان كە لە توانایاندا نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا نەفسی خۆیان فیدا كردبوو بۆ ئیمامی عثمان بۆ ئەوەی ڕێگەیان بدات بە سەرخستنی هەر چەندە ژمارەشیان كەم بوو، بەڵام ئیمامی عثمان ڕێگەی نەدان، ئەگەر ڕێگەی بدابان ئەوا بەرگریان لێدەكرد و دەجەنگان لەگەڵ یاخی بووەكان) .

**١١١** - لە محمد ی كوڕی سیرین وە ووتی : (بێگومان لە ماڵی ئیمامی عثمانی كوڕی عفان كۆمەڵێك لە كۆچكەران و پشتیوانان و كوڕەكانیانی لێبوو، لەوانە : عبد اللهی كوڕی عمر، وە حسن و حسين و

عبد اللهی كوڕی زوبیر، محمدی كوڕی طلحة رضي الله عنهم، پیاوێك لەوانە باشترە لە ئەوە و ئەوە ووتیان : ئەی پێشەوای ئیمانداران، ڕێگەمان بدە لەنێوان ئێمە و ئەوە گرووپە یاخیبووانە [بجەنگین لەگەڵیان] .

ئیمامی عثمان ووتی : من ڕێگە نادەم هیچ پیاوێك لە ئێوە بجەنگن لەگەڵیان وە من كردوومەتە ماف بەسەرخۆمەوە كە هیچ كەس خوێنی نەڕژێت لە پێناوی من، وە من ستایشی هەر یەكێك لە ئێوە دەكەم كە ئەمڕۆ بە نەفسی خۆی منی پاراستووە) .

**١١٢** - جا ئەگەر یەكێك ووتی : (بێگومان زانیان كەوا ئەو مەزڵومە، وە یاخی بووەكان پێداگربوون لە كوشتنی، كەواتە پێویست بوو لەسەریان كە بجەنگن لە پێناوی و بەرگری لێبكەن، ئەگەرچی ئەو ڕێگریشیان لێبكات.

پێی دەووترێ : چەند جوانت ووت، لەبەر ئەوەی قسەت كرد بۆ ئەوەی شتەكان لێك جیابكەیتەوە .

جا ئەگەر ووتی : بۆچی ؟

پێی دەووترێ : لەبەر ئەوەی ئەو قەومە [هاوەڵان و تابعین] خاوەنی گوێڕایەڵی بوون الله تعالی هیدایەتی دابوون بۆ صەواب لە ووتە و كردار، بۆیە ئەوەیان كرد كە پێویست بوو لەسەریان لە نكۆڵی كردن بە دڵ و زمانیان، وە

نەفسی خۆیان فیداکرد بۆ بەرگری لێکردنی بە پێی هێز و توانایان، بەڵام کاتێك ئیمامی عثمان ڕێگری لێکردن لە سەرخستنی زانیان کە واجبە لەسەریان بیستن و گوێڕایەڵی، وە ئەوان بۆیان نییە پێچەوانەی بکەن، وە حەق لەگەڵیان بوو لەوەی ئیمامی عثمان بینی وە لەسەریان بوو .

جا ئەگەر کەسێك ووتی : باشە بۆچی ئیمامی عثمان ڕێگری لێکردن لە سەرخستنی لەکاتێکدا ئەو مەزڵوم بوو، وە بێگومان ئیمامی عثمان دەیزانی کە بجەنگان لەگەڵ یاخیبووەکان ڕێگریکردنە لە خراپە، وە پارێزگاریکردنە لە حەق؟

پێی دەووترێ : وە هەروەها ئەوەش لە بێئاگایی خۆتە .

ئەگەر ووتی : چۆن؟

پێی دەووترێ : ڕێگریکردنی ئیمامی عثمان لە سەرخستنی چەند ڕووێکی هەیە، هەمووی ستایشکراوە :

یەکەمیان : زانستی بەوەی کە ئەو کوژراوێکی زوڵم لێکراوە هیچ گومانێکی تێدا نیە، لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی ڕاگەیاندبوو کە وا تۆ [ئیمامی عثمان رضي الله عنه] دەکوژرێیت بە مەزڵومی، بۆیە ئارامبگرە، ئەویش ووتی : ئارام دەگرم .

جا كاتێك دەورەی ماڵەكەیاندا زانی كەوا ئەو دەكوژرێ، وە ئەوەی كەوا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو بوو ڕاستە و هەر ئەوەیە كە فەرموویەتی پێویستە كە ببێت .

پاشان زانی كە بەڵێنی ئارامگرتنی داوە بە نەفسی خۆی، بۆیە ئارامی گرت وەكو چۆن بەڵێنی دابوو، وە لەلای ئەو وابوو ئەوەی كە داوای سەرخستن و بەرگری كردن بكات بۆ نەفسی خۆی ئەوە ئارامگر نییە، لەكاتێكدا بەڵێنی ئارامگرتنی بە نەفسی خۆی داوە جا ئەوە ڕووێكیان .

وە ڕووێكی تر : ئەو دەیزانی كە ئەوانەی بەرگری لێدەكەن لە هاوەڵان ژمارەیان كەمە، وە ئەوەی دەیانویست بیكوژن ژمارەیان زۆر بوو، جا ئەگەر ڕێگەی دابان بە جەنگ كردن ئەمین نەبوو لەوەی كە هاوەڵانی پێغەمبەرەكەی ڕزگاریان ببێت بە هۆی ئەو، جا پاراستنی بە نەفسی خۆی بەبەزەیی پێهاتنەوە لە ئیمامی عثمانەوە بۆیان، لەبەر ئەوەی ئەو شوانە وە شوانیش واجبە لەسەری كە پارێزگاری لە گەلەكەی بكات بە هەر شتێك كە لەتوانایدا بێت، وە لەگەڵ ئەوەشدا بە دڵنیاییەوە دەیزانی كە ئەو دەكوژرێ، جا پاراستنی بە نەفسی خۆی، وە ئەوەش ڕووێكی تر .

وە ڕووێكی تر : وە ئەو كاتێك زانی كە ئەوە فیتنەیە، وە فیتنەش ئەگەر شمشێری تێدا هەڵكێشرا گەرەنتی نادرێ كەوا كەسانێك تێیدا بكوژرێ كە شایستەی كوشتن نین، جا هەڵینەبژارد بۆ هاوەڵانی كە شمشێر

دەربهێنن لەکاتی فیتنە، وە ئەوەش بەزەییەك بوو لە ئیمامی عثمانەوە بۆیان، فیتنە گشتگیر دەبوو؟ ماڵ و سامانی تێدا بە فیڕۆ دەچوو، وە ئافرەتانی تێدا هەتك دەكرا، جا پاراستنی لە هەموو ئەو شتانە .

وە ڕوویەكی تر ئەوە هەڵدەگرێ كە ئیمامی عثمان رضي الله عنه ڕێگری كرد لە بەرگری لێكردنی بۆ ئەوەی هاوەڵان شایەتی بدەن بۆی لەسەر ئەو كەسانەی كە زوڵمیان لێ كرد، وە سەرپێچی فەرمانی ئەویان كرد، وە خوێنی ئەویان ڕشت بە نا حەق، لەبەر ئەوەی ئیمانداران شایەتی الله تعالى ن لەسەر زەوی، وە لەگەڵ ئەوەشدا پێویست نەبوو كە خوێنی مسوڵمانان بڕێژرێ بەهۆی ئەوەوە، وە پێچەوانەی پێغەمبەر ﷺ نەكات لە ئوممەتەكەی بە ڕشتنی خوێنی مسوڵمانان، وە بەوشێوەی فەرموو، بۆیە ئیمامی عثمان بەو كارەی موفق بوو عوزری هەبوو ئازابوو، وە هاوەڵان رضي الله عنهم عوزریان هەبوو، وە بكوژانی بەدبەخت بوون .

## ١٣ - باسی دەم گرتنەوە لەوەی ڕوویداوە لە نێوان هاوەڵانی رسول الله ﷺ ڕەحمەتی الله تعالى لەسەر هەموویان بێت

محمدی کوڕی حسین رحمه الله دەڵێت :

**١١٣ -** (واجبە لەسەر ئەوکەسەی کە خوێندوویەتیەوە ئەوەی کە نووسیومانە لەبارەی چاکەکانی هاوەڵانی رسول الله ﷺ وە چاکەکانی ئال و بەیتی پێغەمبەر ﷺ هەموویان کەوا خۆشیانی بوێت، وە ڕەحمەتیان بۆ بنێرێت، وە داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکات، وە تەوەسول بەوان بکات بۆلای الله ی بەخشندە **[واتە شوێنیان بکەویت و ڕێگا و مەنهەجی ئەوان بگریت و پێچەوانەی ووتە و کرداریان نەکەیت]**، وە شوکرانەی الله بکات کە تەوفیقی داوە بۆ ئەوە، وە باسی ئەو شتانە ناکات کە ڕوویداوە لە نێوانیان، وە بەدوای ناگەڕێت و ڕۆناچێ تێیدا **[وەك جەنگی جمل و صفين و.....هتد]** .

جا ئەگەر جاهلێك ڕووبەڕوومان بوویەوە کە لە ڕێگەی ڕاست لایداوە و ووتی : بۆچی فلان کەس لەگەڵ فلان کەس شەڕی کرد؟ وە بۆچی فلان کەس فلان کەسی کوشت؟

پێی دەووترێ : من و تۆ هیچ پێویستیەکمان پێی نییە کە ئەوە بزانین وە ناچاریش نین بۆ ئەوەی بیزانین .

جا ئەگەر کەسێك ووتی : بۆچی ؟

پێی دەووترێ : لەبەر ئەوەی ئەو فیتنانە هاوەڵان بینیان و لەسەردەمی ئەوان ڕوویداوە و بەپێی بینینیان بۆ ڕووداوەکان زانستیان پێی هەبووە، بۆیە ئەوان زاناتر بوون بە تەفسیرەکەی لە جگە لە خۆیان، وە ڕێگاکەیان ڕۆشنتر بوو لەوانەی کە لەدوای ئەوانەوە هاتن لەبەر ئەوەی ئەهلی بەهەشت بوون، قورئان بەسەریاندا دابەزی، وە رسول الله یان ﷺ بینی بوو، وە جیهادیان لەگەڵی کردبوو، وە الله تعالى شایەتی بۆ داون بە بەهەشت و لێخۆشبوون و پاداشتی گەورە، وە رسول الله ﷺ شایەتی بۆ داون کە باشترین سەدە سەدەی ئەوانە .

بۆیە لە هەموو کەس زاناتر بوون بە الله و پێغەمبەرەکەی ﷺ و بە قورئان و بە سوننەت، وە عیلم لەوان وەردەگیرێ، وە بە ووتەی ئەوان دەژین، وە بە حوکمەکانیان حوکم دەکەین، وە بە ڕەوشت و ئادابی ئەوان خۆمان پەروەردە دەکەین، وە شوێنی ئەوان دەکەوین چونکە بەوە فەرمانمان پێکراوە .

جا ئەگەر ووتی : باشە چ زەرەرێکمان پێدەگات بە زانینمان بەوەی ڕوویداوە لە نێوانیان وە بگەڕێین بۆی ؟

پێی دەووترێ: ئەوەی شك و گومانی تێدا نییە، ئەوەیە کە عەقڵی هاوەڵان زۆر گەورەترە لە عەقڵی ئێمە، عەقڵی ئێمە زۆر کەمترە بەبەراورد بە عەقڵی ئەوان، وە ئەمین نابین لەوەی کە ئەگەر بگەڕێین لەوەی ڕوویداوە لە نێوانیان قاچمان بخلیسکێ لە ڕێگای ڕاست، وە پێچەوانەی ئەوە بکەین کە فەرمانمان پێکراوە لەبارەی ئەوان.

جا ئەگەر ووتی: بەچی فەرمانمان پێکراوە لەبارەی ئەوان؟

پێی دەووترێ: فەرمانمان پێکراوە بە داوای لێخۆشبوونکردن بۆیان، وە ناردنی ڕەحمەت بۆیان، وە خۆشمان بوێن و شوێنیان بکەوین، بەڵگە هەیە لەسەرئەوە لە قورئان و سوننەت و ووتەی پێشەوایانی مسوڵمانان، وە هیچ پێویستییەکمان نییە بە باسکردنی ئەوەی ڕوویداوە لە نێوانیان، هاوەڵییەتی رسول الله یانکرد ﷺ وە بوونە زاوای ئەو و ئەویش بووە زاوای ئەوان، جا بە هاوەڵیەتی کردنی ئەوان بۆ رسول الله ﷺ الله ی بەخشندە لێیان خۆش دەبێت، وە بێگومان الله عزَّوَجَل گەرەنتی داوە لە کتابەکەی کەوا هیچ یەك لە هاوەڵان سەرشۆڕ نەکات.

وە بەڕاستی الله تعالى بۆی باسکردووین لە کتابەکەی کە خۆی وەسفی کردوون لە تەوڕات و ئینجیل، وەسفی کردوون بە جوانترین و باشترین وەسفکردن.

وه هەواڵی پێداوین الله ی بەخشندە کە تەوبەی لێوەرگرتوون، وە گەر لێیان خۆشبوویێت هیچ یەکێك لەوان سزا نادات هەرگیز رضي الله عنهم وە لێشیان ڕازی بووە، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱللَّهِۚ أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾، [المُجادَلة : ٢٢] .

جا ئەگەر یەکێك ووتی : بەڕاستی مەبەستی من لەوە ئەوەیە کە عیلمم هەبێت بەوەی ڕوویداوە لە نێوانیان وە بەسەرم تێناپەڕێت تەنیا ئەوەی کە ئەوان تێیدا بوونە، لەبەر ئەوەی من پێم خۆشە نەزان نەبم پێی .

پێی دەوترێ : تۆ بە بەدوای فیتنەدا دەگەڕێی، لەبەر ئەوەی تۆ بەدوای ئەوەدا دەگەڕێی کە زیانت پێدەگەیەنێ و سوودت پێناگەیەنێت، ئەگەر مەژغوڵ بیت بە چاککردن و فێربوونی ئەو مافەی الله عزَّوَجَل کە لەسەرتە لەو پەرستشانەی کە بۆی دەکەیت لە جێبەجێکردنی فەرزەکانی، وە دوورکەوتنەوە لە حەرامکراوەکانی لە پێشتربوو بۆ تۆ .

وە دەووترێ : سەرەڕای ئەو هەواو ئارەزووە ناشرینە گومڕاییانەی کە لەو سەردەمەی ئێمە دەرکەوتووە .

وە پێی دەووترێ : مەژغوڵ بوونت بەوەی خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگت لە کوێ بەدەستی دەهێنی؟ لە پێشترە بۆ تۆ، وە کار و کاسبیت و دینار و درهەمت لە کوێ بەدەستی دەهێنی؟ وە لەچی خەرجی دەکەی؟ لە پێشترە بۆ تۆ .

وە دەووترێ : ئەمین نابم بە گەڕانت و لێکۆڵینەوەت لەوەی ڕوویداوە لە نێوان هاوەڵان دڵت بە لاڕێدا بچێت، جا تووشی بیدعەیەك ببیت کە چاك نییە بۆتۆ کە تووشی ببیت، وە شەیتان یاریت پێ بکات و جنێو بدەیت و ڕقت ببتەوە لەو کەسەی کە اللە تعالى فەرمانی پێکردوویت بە خۆشویستنی و داوای لیخۆشبوون کردن بۆی بە شوێنکەوتنی، لە ئەنجامدا پێت بخلیسکێ لە ڕێی ڕاست و ڕێگەی باطل بگریت .

جا ئەگەر ووتی : بۆمان باسبکە لە قورئان و سوننەت، وە لە زانایانی مسوڵمانان لە سلف کە بەڵگە بێت بۆ ئەوەی کە ووتت بۆ ئەوەی نەفسمان بگەڕێنێتەوە لەو شتانەی کە ئارەزووی دەکات لە گەڕان بە دوای ئەو شتانەی ڕوویداوە لە نێوان هاوەڵان رضي اللە عنهم .

پێی دەووترێ : ئەوەی باست کرد لە پێشدا باسمان کردووە کە ڕوونکردنەوە و بەڵگەیە بۆ ئەوانەی کە بیر دەکەنەوە، وە هەندێك لەوانەی باسمان کرد دووبارەی دەکەینەوە بۆ ئەوەی ئیمانداری بەدوای حەقدا گەڕاو بە ئاگا بێتەوە :

اللە تعالى دەفەرمووێ : ﴿مُّحَمَّدٞ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ

**أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ﴾**، **[الفَتْح : ٢٩]** .

پاشان بەڵێنی پێیاندا دوای ئەوە بە لێخۆشبوون و پاداشتی هەرە گەورە .

وە هەروەها الله تعالی دەفەرمووێ : **﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ﴾** **[التوبَة : ١١٧]** .

وە الله عزَّوَجَل دەفەرمووێ : **﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ﴾** **[التوبَة : ١٠٠]** هەتاوەكو كۆتايی ئايەتەكە .

وە الله عزَّوَجَل دەفەرمووێ : **﴿يَوۡمَ لَا يُخۡزِي ٱللَّهُ ٱلنَّبِيَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥۖ نُورُهُمۡ يَسۡعَىٰ بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَبِأَيۡمَٰنِهِمۡ﴾**، **[التحريم : ٨]** ئايەتەكە .

وە الله عزَّوَجَل دەفەرمووێ : **﴿كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِۗ وَلَوۡ ءَامَنَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۚ مِّنۡهُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾** **[آل عِمرَان : ١١٠]** .

وە الله عزَّوَجَل دەفەرمووێ : **﴿لَّقَدۡ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ يُبَايِعُونَكَ تَحۡتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيۡهِمۡ وَأَثَٰبَهُمۡ فَتۡحٗا قَرِيبٗا﴾**، **[الفَتْح : ١٨]** .

پاشان بێگومان الله تعالی مەدحی ئەوەی کردووە کە لە دوای هاوەڵانەوە هاتووە جا داوای لێخۆشبوونی کردووە بۆ هاوەڵان وە داوای لە الله ی بەخشندە کردووە کە هیچ ڕق و کینێك نەخاتە دڵیەوە بەرامبەریان، بۆیە الله تعالی مەدحی دەکات بە باشترین مەدح کردن، الله تعالی دەفەرموێت :

﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ﴾ [الحَشْر : ١١٧] .

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : (باشترینی خەڵکی سەردەمەکەی منە پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن) .

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : (بەڕاستی الله تعالی هاوەڵانمی هەڵبژاردووە لەسەر هەموو جیهانیان جگە لە پێغەمبەران و نێردراوان، وە هەڵیبژاردووە بۆم لەناو هاوەڵانم چواریان أبو بکر و عمر و عثمان و علی رضي الله عنهم، جا کردوونی بە باشترینی هاوەڵانم وە هاوەڵانم هەموویان باشترینن، وە ئوممەتەکەمی هەڵبژاردووە بەسەر هەموو ئوممەتەکاندا) .

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : (بەڕاستی نموونەی هاوەڵانم لە ناو ئوممەتەکەم وەکو خوێ وایە لەناو خواردن، خواردن چاك نابێ تەنها بە خوێ نەبێ) .

ئەو فەرموودەیە ڕیوایەتکراوە لە حەسەنەوە، لە ئەنەسەوە، لە پێغەمبەرەوە .

ووتی : ئیمامی حەسەن ئەگەر ئەو فەرموودەیەی بگێڕابایەتەوە دەیووت : بەڕاستی خوێکەمان ڕۆیشتووە جا چۆن چاك دەبین؟

وە عبد الله ی کوڕی مسعود رضي الله عنه دەڵێت : بێگومان الله عزَّوَجَل سەیری دڵی بەندەکانی کرد جا بینی دڵی محمد ﷺ باشترینی دڵی بەندەکانە بۆیە هەڵیبژارد بۆ نەفسی خۆی، وە ناردی بە پەیامەکەی، پاشان سەیری دڵی بەندەکانی کرد دوای دڵی محمد ﷺ جا بینی دڵی هاوەڵەکانی باشترین دڵن لەناو بەندەکان، جا ئەوانی کرد بە وەزیرەکانی پێغەمبەر دەجەنگان لەسەر دینەکەی .

محمدی کوڕی حسین رحمە الله دەڵێت :

**١١٤** - دەوترێ بەوکەسەی کە ئەوەی بیستووە لە الله تعالی و لە رسول الله : ئەگەر تۆ بەندەیەکی تەوفیقدراو بیت بۆ خێر ئامۆژگاری وەردەگریت بەوەی الله تعالی ئامۆژگاری پێکردوویت، وە ئەگەر تۆ شوێنکەوتەی هەواو ئارەزووت بیت دەترسم لەوانە بیت کە الله تعالی دەربارەیان دەفەرمووێ : ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ [**القَصَص** : ٥٠] .

وە لەوانە بیت کە الله تعالی دەربارەیان دەفەرمووێ : ﴿وَلَوْ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ ۖ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ﴾ [**الأنفَال** : ٢٣] .

وە پێی دەووترێ : ئەوەی هات بۆ لای هاوەڵانی رسول الله ﷺ هەتاوەکو تانە لە هەندێکیان بدات، وە قسە بە هەندێکیان بڵێت، وە زەمی هەندێکیان بکات، وە مەدحی هەندێکیان بکات، ئا ئەوە کەسێکە بەدوای فیتنەدا دەگەڕێت، وە کەوتۆتە ناو فیتنەوە، لەبەرئەوەی واجبە لەسەری هەمووانی خۆش بوێت و داوای لێخۆش بوون بۆ هەموویان بکات رضي الله عنهم، وە سوود و قازانج بکەین بە خۆشویستنیان، وە ئێمە زیاتر بۆت ڕووندەکەینەوە بۆ ئەوەی دڵت سەلامەت بێت بەرامبەر گشتییان و وازهێنی لە گەڕان و لێکۆڵینەوە لەوەی ڕوویداوە لە نێوانیان .

**١١٥** - عبد اللەی کوڕی عباس رضي الله عنهما دەفەرمووێ : جنێو مەدەن بە هاوەڵانی محمد ﷺ، چونکە الله تعالى فەرمانی پێکردووین بە داوای لێخۆشبوون کردن بۆیان وە ئەو دەیزانی کە ئەوان لەگەڵ یەکتری دەجەنگن .

**١١٦** - عبد اللەی کوڕی عباس رضي الله عنهما دەفەرمووێ : (الله تعالى فەرمانی پێکردووین بە داوای لێخۆشبوون کردن بۆ هاوەڵانی محمد ﷺ وە ئەو دەیزانی کە ئەوان لەگەڵ یەکتری دەجەنگن) .

**١١٧** - عوامى كوڕى حوشب دەڵێت : باسى چاكەكانى هاوەڵانى محمد ﷺ بكەن دڵتان هۆگر دەبێت لەسەرى و ئەوانتان خۆش دەوێت، وە باسى جگە لەوە مەكەن و ببێتە هۆى ئەوەى خەڵكى هاندەن لەسەريان .

**١١٨** - أبي ميسره دەڵێت : لە خەونمدا خێمەيەكم بينى كەلەسەر زەويەكى سەوز چەقێنرابوو، جا ووتم ئەوە بۆ كێيە؟

ووتيان : بۆ ذي الكلاع و هاوەڵەكانييەتى، وە خێمەيەكى بينى لە زەويەكى سەوز، جا ووتم ئەوە بۆ كێيە؟

ووتيان : بۆ عەممار و هاوەڵەكانيەتى .

جا ووتم : ئەوە چۆنە لەكاتێكدا هەندێكيان لە هەندێكيانى كوشتووە؟ ووتى : بەڕاستى ئەوان بينيان كە الله تعالى لێخۆشبوونى زۆر فراوانە .

**١١٩** - أبي وائل دەڵێت : عمرو كوڕى شرحبيل أبو ميسرەى بينى، كە لە گەورە هاوەڵانى عبد اللهى كوڕى مسعود رضي الله عنه بوو، ووتى : بينيم وەكو ئەوەى چووبێتمە ناو بەهەشتەوە كە خێمەكەم بينى، جا ووتم : ئەوە بۆ كێيە؟ ووتيان : بۆ ذي الكلاع و حوشبە، كە لەگەڵ ئەوانە بوون كە بەرەى معاويه رضي الله عنه كوژرا بوون .

جا ووتم : ئەی عەممار لە كوێیە؟

ووتیان : لە پێشتە .

ووتم : لەكاتێكدا هەندێكیان لە هەندێكیانی كوشتووە؟

ووتی : گەیشتنەوە بە الله تعالى جا بینیان كە الله تعالى لێخۆشبوونی زۆر فراوانە .

**١٢٠** - عبد ربە دەڵێت : ئیمامی حەسەنی بصري ڕحمە الله لە مەجلیسێكدا بوو و باسی ووتەیەكی كرد، وە باسی هاوەڵانی محمد ﷺ ی كرد، جا ووتی : ئەوانە هاوەڵانی محمد ﷺ باشترین دڵیان هەبوو لەو ئوممەتەدا رضي الله عنە، وە قووڵترین و زۆرترین زانستیان هەبوو، وەكەمترین زۆر لە خۆ كردنیان هەبوو، قەومێك بوون كە الله تعالى هەڵیبژاردبوون بۆ هاوەڵیەتی پێغەمبەرەكەی و جێگیركردنی دینەكەی، جا خۆتان بچوێنن بە خوورەوشت و ڕێگاكەیان چونكە بێگومان سوێند بە پەروەردگاری كەعبە ئەوان لەسەر هیدایەت و ڕێگە ڕاستەكەن .

# ١٤ - پەناگرتنی پێغەمبەر ﷺ لە فیتنەی دەجال وە فێرکردنی ئوممەتەکەی کە پەنا بگرن بە الله تعالی لە فیتنەی دەجال

**١٢١** - لە عائیشەوە رضي الله عنها، کە وا پێغەمبەر ﷺ دوعای دەکرد و دەیفەرموو : (یا الله پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی ئاگر، وە لەسزای ناو ئاگر، وە لە فیتنەی گۆڕ، وە لە سزای ناو گۆڕ، وە لە خراپەی فیتنەی دەوڵەمەندی، وە لە خراپەی فیتنەی هەژاری، وە پەنات پێدەگرم لە خراپەی مسیح الدجال) .

**١٢٢** - لە عائیشەوە رضي الله عنها فەرمووی : کە پێغەمبەر ﷺ دوعای دەکرد و دەیفەرموو : (یا الله پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی ئاگر، وە لەسزای ناو ئاگر، پەنات پێدەگرم لە فیتنەی گۆڕ، وە پەنات پێدەگرم لە فیتنەی مسیح الدجال، وە پەنات پێدەگرم لە تەمبەڵی و لە پیری، وە هەموو جۆرەکانی گوناح و تاوان و قەرزاری) .

**١٢٣** - له عائیشەوه رضي الله عنها، كەوا پێغەمبەر ﷺ دوعای دەكرد بەو ووشانە، وه باسی كرد تێیدا : (وه پەنات پێدەگرم له فیتنەی مسیح الدجال) .

وه باسی فەرموودەكەی كرد، وه كۆمەڵە ڕێگایەكی هەیە .

**١٢٤** - له ئەبو هریر ەوه رضي الله عنه، فەرمووی : رسول الله ﷺ پەنای دەگرت به الله له سزای دۆزەخ، وه له سزای گۆڕ، وه مەسیحی الدجال .

له ئەبو هریرەوه رضي الله عنه، له رسول الله ﷺ كه وا دەیفەرموو : (یا الله پەنات پێدەگرم له فیتنەی گۆڕ و له سزای گۆڕ، وه خراپەی فیتنەی زیندوو و مردوو، وه خراپەی فیتنەی مەسیحی الدجال) .

**١٢٥** - له ئەبو هریر ەوه رضي الله عنه، له رسول الله ﷺ كەوا دەیفەرموو : (یا الله پەنات پێدەگرم له فیتنەی گۆڕ و له سزای گۆڕ، وه خراپەی فیتنەی زیندوو و مردوو، وه خراپەی فیتنەی مەسیحی الدجال) .

**١٢٦** - له ئەبو هریرەوە رضي الله عنه، فەرمووی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەگەر یەکێکتان تەحیاتی خوێند ئەوا با پەنا بگرێت بە الله لە چوار شت : لە سزای دۆزەخ، وە سزای گۆڕ، وە فیتنەی زیندوو و مردوو، وە فیتنەی مەسیحی الدجال) .

**١٢٧** - لە عبد اللەی کوڕی عباسەوە رضي الله عنهما، کەوا رسول الله ﷺ ئەو دوعایەی فێردەکردن وەکو چۆن سورەتێك لە قورئانی فێردەکردن ، وە دەیفەرموو : بڵێن : (یا الله ئێمە پەنات پێدەگرین لە سزای دۆزەخ، وە پەنات پێدەگرم لە سزای گۆڕ، وە پەنات پێدەگرم لە فیتنەی مەسیحی الدجال، وە پەنات پێدەگرم لە فیتنەی زیندوو و مردوو) .

**١٢٩** - ابن وهب رحمه الله دەڵێ : وە بۆی باسکردم مالك وە فەرموودەکەی بۆ باسکردم بەهەمان شێوە .

**١٣٠** - لە أبي سعیدی خودریەوە رضي الله عنه : کە وا پێغەمبەر ﷺ دوعای دەکرد بەو ووشانە : (یا الله پەنات پێدەگرم لە سزای ئاگر، وە سزای گۆڕ، وە لە فیتنەی زیندوو و مردوو، وە لە فیتنەی مەسیحی الدجال) .

محمدی كوڕی الحسين رحمه الله دەڵێت :

بێگومان پێغەمبەر ﷺ پەنای گرتووە بە الله تعالى لە فیتنەی دەجال، وە ئوممەتەكەشی فێركردووە كە پەنابگرن بە الله لە فیتنەی دەجال، بۆیە پێویستە لەسەر مسوڵمانان كەوا پەنا بگرن بە الله لێی .

وە ئوممەتەكەی ئاگادار كردووەتەوە لە زیاتر لە فەرموودەیەك لە فیتنەی دەجال، وە وەسفی بۆ كردوون، جا پێویستە لەسەر مسوڵمانان كە ئاگاداری بن وە پەنا بگرن بە الله لە زەمانێك كە دەجال تێیدا دەردەچێت، جا پێویستە لەسەر مسوڵمانان كە ئاگاداری بن وە پەنا بگرن بە الله لە زەمانێك كە دەجال تێیدا دەردەچێت، چونكە بەڕاستی زەمانێكی قورسە، الله تعالى پەنای ئێمە و ئێوەش بدات لە دەجال .

وە بێگومان ڕیوایەت كراوە كە ئەو دروستكراوە، وە ئەو لە ژیاندایە و بەستراوەتەوە بە ئاسن تا ئەوكاتەی الله تعالى ڕێگە دەدات بە دەرچوونی .

**١٣١** - لە عمران ی كوڕی حصين ـەوە رضي الله عنه، لە پێغەمبەر ـەوە ﷺ دەفەرمووێ : (ئەمما بێگومان ئەو خواردنی خواردووە، وە هاتووچۆی كردووە لە بازاڕەكان) واتە : الدجال .

١٣٢ - له ئەبو میعقل ەوە : كەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : (بێگومان ئەو خواردنی خواردووە، وە هاتووچۆی كردووە له بازاڕەكان) واتە : الدجال .

١٣٣ - له ئەنەسی كوڕی مالكەوە رضي الله عنه، كەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : (دەجال چاوێكی كوێرە، كە پێستێكی ئەستوور لەسەر چاویەتی [وەك پارچە گۆشتی بەسەر چاویدا شۆڕبۆتەوە، والله اعلم]، له نێوان دوو چاوەكانی نوسراوە كافر) .

١٣٤ - له عبادەی كوڕی صامت ەوە رضي الله عنه، ووتی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (بێگومان من ئەوەندە باسی دەجالم بۆ كردوون هەتاوەكو ترسام كە تێنەگەن، بەڕاستی مەسیحی دەجال پیاوێكی كورتە بالایە، قژلوولە، چاوێكی كوێرە و نە دەرپەڕیوە نە قوولە، جا ئەگەر سەرتان لێشێوا، ئەوا بزانن كە پەروەردگارتان عزَّوَجَل چاوێكی كوێر نییە، وە بشزانن كەوا ئێوە پەروەردگارتان عزَّوَجَل نابینن هەتاوەكو دەمرن) .

١٣٥ - له ئەبو ئومامە وە رضي الله عنه، دەڵێت : رسول الله ﷺ ووتاری بۆ داین كە كۆتا ووتاری بوو كە باسی دەجالمان بۆ بكات، وە ئاگاداری

دەکردینەوە ، وە لە ووتەکانی : (ئەی خەڵکینە، بێگومان هیچ فیتنەیەك لەسەر ڕووی زەوی نییە گەورەتر بێت لە فیتنەی دەجال، وە الله تعالى هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە ئیللا قەومەکەی ئاگادارکردووەتەوە لێی، وە من دواهەمینی پێغەمبەرانم، وە ئێوەش کۆتا ئوممەتن، وە ئەو لەناو ئێوە دەردەچێت هیچ مەجالی تێدا نییە، جا ئەگەر دەرچوو و من لەناوتاندا بووم، ئەوا من لەبری هەموو مسوڵمانێك گفتوگۆی لەگەڵدا دەکەم، وە گەر لەپاش من دەجال دەرچوو ئەوا هەرکەسێ پێویستە خۆی بپارێزێ و لێی دوورکەوێتەوە، وە الله تعالى چاودێرە بەسەر هەموو مسوڵمانێك و دەیانپارێزێت) .

١٣٦ - لە عبد اللهی کوڕی عومەرەوە رضي الله عنهما : کەوا پێغەمبەر ﷺ : ڕۆژێك باسی دەجالی کرد، جا ووتی : (بێگومان ئەو چاوی ڕاستی کوێرە، وەکو ترێیەکی دەرپەڕیو وایە) .

١٣٧ - لە سەمعان الكلابييەوە رضي الله عنه، دەفەرمووێ : بەیانیەکیان رسول الله ﷺ باسی دەجالی کرد، هەندێکجار باسی دەکرد بە گرنگییەوە و هەندێکجاریش گرنگی پێ نەدەدا، هەتاوەکو وا بیرمان کردەوە کە لەناو هێشووە دار خورماکانە، کاتێك لە ئێوارەدا چووین بۆلای بە

ڕووخسارمانەوە دیار بوو و هەستی پێکرد، جا لێمان پرسی و پێمان ووت : ئەی ڕسول الله ﷺ، ئەم بەیانییە باسی دەجالت کرد، هەندێکجار باست دەکرد بە گرنگییەوە و هەندێکجاریش گرنگیت پێ نەدەدا، هەتاوەکو وا بیرمان کردەوە کە لەناو هێشووە دار خورماکانە، جا فەرمووی : (ئەوە شتێکە جگە لە دەجال کە من لێی دەترسێم لەسەرتان، جا ئەگەر دەرچوو و من لەناوتاندا بووم، من بەسم بۆ ئێوە و لەبری هەموو مسوڵمانێك گفتوگۆی لەگەڵدا دەکەم، وە ئەگەر دەرچوو و من لەناوتاندا نەبووم ئەوا هەریەك لە ئێوە با خۆی بپارێزێت لێی و دووربکەوێتەوە لێی، الله تعالى چاودێرە بەسەر هەموو مسوڵمانێك و دەیانپارێزێت) .

١٣٨ - لە فاطمەی کچی قیسەوە رضي الله عنها : دەڵێت : (پێغەمبەر ﷺ بەرزبووەوە بۆ سەر مینبەرەکەی، وە پێش ئەو ڕۆژە نەدەچووە سەر مینبەرەکەی تەنها ڕۆژی جومعە نەبێ، یان هاوشێوەی ئەوەی ووتی، جا خەڵکی ئەوەیان لا سەیر بوو بۆیە هەندێکیان دانیشتن هەندێکیان یان وەستا بوون، جا بە دەست ئاماژەی بۆ کردن : کە دانیشن، سوێند بە الله، من لێرە ڕانەوەستاوم بۆ شتێك کە سوودتان پێبگەیەنێت لە ئامۆژگارییەك یان ئاگادارکردنەوەیەك، بەڵام تمیم الداري هات بۆلام و هەواڵێکی پێڕاگەیاندم ڕێگری لێکردم لە ئیسراحەتکردنم لەبەر دڵخۆشبوونم بەو هەواڵە، کوڕە

مامێکی تەمیمی داری پێی ووتم کە سواری کەشتی بوون لە دەریایەك، تووشی بایەکی بەهێز بوون لەناو دەریادا، بردنی بۆ دوورگەیەك لە دوورگەکانی ناو دەریا کە پێشتر نەیانبینی بوو، جا دانیشتن، وە خلف جارێکی تر ووتی : سواری تەنیشتەکانی کەشتیەکە بوون، پاشان هاتنە دەرەوە و چوونە ناو دوورگەکە، لەوێ کەسێکی ڕەشی برژانگ گەورەی تووکنیان بینی، جا پێیان ووت : تۆ چیت؟

ئەویش ووتی من جەساسەم، پێیان ووت : هەواڵمان پێبدە دەربارەی خەڵکی؟

پێی ووتن : هەواڵی هیچ شتێکتان پێنادەم و پرسیاری هیچ شتێکیشتان لێناکەم، بەڵام بڕۆنە لای ئەو ئەشکەوتە، پیاوێکی لێیە زۆر تامەزرۆیە بۆئەوەی هەواڵی بدەنێ و هەواڵتان بداتێ، جا چوون بۆ لای و داوای ئیزنیان لێکرد و چوونە ژوورەوە، پیاوێکی بەتەمەنیان بینی کە زۆر بەتوندی کۆت و زنجیر کرابوو، زۆر بە گلەیی بوو، خەم و پەژارەی پێوە دیار بوو، پێی ووتن : لە کوێوە هاتوون، پێیان ووت : لە شامەوە،

ووتی : چی ڕوویداوە لەناو عەرەب؟

ووتیان : ئێمە قەومێکین لە عەرەب، لەبارەی چییەوە پرسیار دەکەیت؟

ووتی : ئەو پیاوەی کە لەناو ئێوەدا دەرکەوتووە چی کردووە؟

ووتيان : تەنها چاكەی كردووە، هەندێك لە قەومەكەی دوژمنایەتیان كرد، بەڵام الله تعالى سەری خست بەسەریاندا، ئێستا ئەوان بوون بە یەك، دینیان یەكە، وە پێغەمبەریان یەكە، وە وە خوایان یەك .

ووتی : ئەوە باشە بۆیان .

جا ووتی : ئەی چی بەسەر بیری زغر هاتووە؟

ووتیان : لێی دەخۆنەوە و كشتوكاڵەكانیشیان پێ ئاو دەدەن .

پاشان ووتی : ئەدی چی هاتووە بەسەر دارخورماكانی نێوان عمان و بیسان؟

ووتیان : هەموو ساڵێك بەر دەگرێ .

ووتی : چی هاتووە بەسەر دەریاچەی الطبریه؟

ووتیان : لە لێوارەكانی دەڕژێ بەهۆی زۆری ئاوەكەی .

ووتی : سێ هەناسەی قووڵی هەڵكێشا .

پاشان ووتی : ئەگەر من ئازاد بووم لەو زنجیرانە، ئەوا هیچ زەوییەكم بەجێنەهێشتووە ئیللا پێیەكانم بینیویەتی بێجگە لە طیبە نەبێ هیچ توانایەكم بەسەریدا نییە .

جا رسول الله فەرمووی : بۆ ئەوە زۆر دڵخۆشبووم، ئەوە طيبەيە - واتا مەدينە - سوێند بەو كەسەی نەفسی محمدی بەدەستە هيچ ڕێگايەك نييە تەسكبێت يان فراوان، دۆڵ بێت يان چيا، ئيللا فريشتەيەك لەسەری وەستاوە شمشێرەكەی هەڵكێشاوە هەتاوەكو ڕۆژی قيامەت) .

**١٣٩** - لە فاطمةی كچی قيس ەوە : (كە پێغەمبەر ﷺ نوێژی نيوەڕۆی كرد و پاشان بەرزبووەوە بۆ سەر مينبەرەكەی، وە پێش ئەو ڕۆژە نەدەچووە سەر مينبەرەكەی تەنها ڕۆژی جومعە نەبێ، جا خەڵكی ئەوەيان لا سەير بوو بۆيە هەندێكيان دانيشتن و هەندێكيان وەستا بوون، جا بە دەست ئيشارەتی بۆ كردن : كە دانيشن، جا فەرمووی : سوێند بە الله، من لێرە ڕانەوەستاوم بۆ شتێك كە سوودتان پێبگەيەنێت لە ئامۆژگارييەك يان ئاگاداركردنەوەيەك، بەڵام تميم الداري هات بۆلام و هەواڵێكی پێڕاگەياندم ڕێگری لێكردم لە ئيسراحەتكردنم لەبەر دڵخۆشبوونم بەو هەواڵە، جا پێم خۆش بوو دڵخۆشی پێغەمبەرەكەتان پێڕابگەيەنم، كوڕە مامێكی تەميمی داری پێی ووتم كە سواری كەشتی بوون لە دەريايەك، تووشی بايەكی بەهێز بوون لەناو دەريادا، بردنی بۆ دوورگەيەك لە دوورگەكانی ناو دەريا كە پێشتر نەيانبينی بوو، جا دانيشتن - وە خلف جارێكی تر ووتی : سواری تەنيشتەكانی

کەشتیەکە بوون، پاشان هاتنە دەرەوە و چوونە ناو دوورگەکە، لەوێ کەسێکی ڕەشی برژانگ گەورەی تووکنیان بینی، جا پێیان ووت : تۆ چیت؟

ئەویش ووتی من جەساسەم .

پێیان ووت : هەواڵمان پێبدە دەربارەی خەڵکی؟

پێی ووتن : هەواڵی هیچ شتێکتان پێنادەم و پرسیاری هیچ شتێکیشتان لێناکەم، بەڵام بڕۆنە لای ئەو دەیرە [شوێنی پەرستشی گاورەکان]، پیاوێکی لێیە زۆر تامەزرۆیە بۆئەوەی هەواڵی بدەنێ و هەواڵتان بداتێ، جا چوون بۆ لای و داوای ئیزنیان لێکرد و چوونە ژوورەوە، پیاوێکی بەتەمەنیان بینی کە زۆر بەتوندی کۆت و زنجیر کرابوو، زۆر بە گلەیی بوو، خەم و پەژارەی پێوە دیار بوو .

پێی ووتن : لە کوێوە هاتوون؟

پێیان ووت : لە شامەوە .

ووتی : چی ڕوویداوە لەناو عەرەب؟

ووتیان : ئێمە قەومێکین لە عەرەب، لەبارەی چییەوە پرسیار دەکەیت؟

ووتی : ئەو پیاوەی کە لەناو ئێوەدا دەرکەوتووە چی کردووە؟

ووتیان : تەنها چاکەی کردووە، کۆمەڵێك لە قەومەکەی دژایەتیان کرد، وە کۆمەڵێکیش بەڕاستیان خستەوە .

ووتی : جا دین و خوایان یەکە؟

ووتیان : بەڵێ، بەڵام الله تعالی سەری خست بەسەریاندا، ئێستا ئەوان بوون بە یەك، دینیان یەکە، وە پێغەمبەریان یەکە، وە وە خوایان یەکە .

ووتی : ئەوە باشە بۆیان .

جا ووتی : ئەی چی بەسەر بیری زغر هاتووە؟

ووتیان : لێی دەخۆنەوە و کشتوکاڵەکانیشیان پێ ئاو دەدەن .

پاشان ووتی : ئەی چی هاتووە بەسەر دارخورماکانی نێوان عمان و بیسان؟

ووتیان : هەموو ساڵێك بەر دەگرێ .

ووتی : چی هاتووە بەسەر دەریاچەی الطبرية؟

ووتیان : لە لێوارەکانی دەڕژێ بەهۆی زۆری ئاوەکەی .

ووتی : سێ هەناسەی قووڵی هەڵکێشا، پاشان ووتی : ئەگەر من ئازاد بووم لەو زنجیرانە، ئەوا هیچ زەوییەکم بەجێنەهێشتووە ئیللا پێیەکانم بینیویەتی بێجگە لە طيبة نەبێ هیچ تواناییەکم بەسەریدا نییە .

جا رسول الله ﷺ فەرمووی : بۆ ئەوە زۆر دڵخۆشبووم. ئەوە طيبەيە - واتە مەدينە - سوێند بەو كەسەی نەفسی محمدی بەدەستە هيچ ڕێگايەك نييە تەسك بێت يان فراوان، دۆڵ بێت يان چيا، ئيللا فريشتەيەك لەسەری وەستاوە شمشێرەكەی هەڵكێشاوە هەتاوەكو ڕۆژی قيامەت .

كۆمەڵێك لە قەومەكەی دژايەتيان كرد، وە كۆمەڵێكيش بەڕاستيان خستەوە .

ووتی : جا دين و خوايان يەكە؟

ووتيان : بەڵێ .

**تەواو بوو الحمدلله، الله بمانپارێزێت لەتەواوی فيتنەكان، وە ئيمان و عەقيدەمان سەلامەت بكات .**

**والحمدلله حق حمده**

**وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم**

**https://t.me/KitabSalaff**